یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

ساڵی حەوتەم
75
ئەیلولی ٢٠١٤

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## کۆترەکەی ئاشتی کڕە!

## نیشتمانێک بۆ هەموو ساتەکان!

## بابە هاتەوە، پێی دەڵێم..

## گەنجینەکەت بەکاربێنە!!

## ناڵەی جودایی

## ئەی مرۆڤ تۆ بەنرخیت!

## بیڵ گەیتس، یەکەم دەوڵەمەندی ساڵی ٢٠١٤



# No:75

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــارس

زاهـیـر زانـا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محێدین

**بەشی هونەریو دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-

نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com




bryarmagazine

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك

07708649210

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد







مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی حەوتەم - ژمارە 75 - ئەیلولی 2014


4


8


10


13


14


15

# کارگێڕیو بازاڕسازی




# نیشتمانێک بۆ هەموو ساتەکان!

مرۆڤ، دوور لە زێدو نیشتمانی، نامۆو بێ دایکو بێکەسە، لە باوەشی ئارامی نیشتماندا، هەست بە ئازادیو ئارامیی هەناسەی ژیان دەکەیت!

ئەو نیشتمانەی بۆ یەکەمین جار، لەسەر خاکو خۆڵی ئەو، چاوت بە دنیا هەڵهێناوەو یەکەمین هەنگاوەکانت، لەسەر سنگی ئەو ناوە، ئەستەمە لە یادکردنو فەرامۆشکردنی.

ئەو وڵاتەی پەڕاوی یادو یادەوەریو خەندەو پێکەنینو گریانو هەموو ساتەکانی ژیانتە. گوناهێکی گەورەیە، لە ناخۆشترین ساتو دژوارترین بارودۆخدا، نکوڵی لێ بکەیت!

ئەوەی لە خۆشییەکاندا، لە باوەشی نیشتماندا، لە کەیفو سەفای خۆیدا ڕابوێرێو لە ناخۆشیدا خۆزگە بخوازێت، کە خەڵکی ئەم نیشتمانە نەبا، ئەوە نازانێ، نیشتمان یانی چی؟!

ئەوەی تەنها لە خێروبێری ئەم وڵاتە دەخواو هێندەی هەڵمژینی هەواکەی، هەڵاڵەی نازونیعمەتی ئەم وڵاتە هەڵدەمژێ، بەڵام ئامادەی بەخشین نییە، ئەوە نازانێ، نیشتمان یانی چی؟

کەسێك، کە تا دوێنێ، ئاوارەی تاراوگەو هەندەران بووەو هەموو ئاواتی ئەوە بووە: تەنها جێگای قاچەکانی بکەنەوە، لە سووچی هەر وڵاتێکدا بێت، ئەمڕۆ بە پانتایی نیشتماندا، دێتو دەچێو دەگوزەرێ، کۆشكو تەلاری بەرزی بنیاتناوەو لەنێو گوڵو گوڵزاری ئەم نیشتمانەدا، خۆری لێ هەڵدێو ئەستێرەی لێ ئاوا دەبێ.. دەبێ بزانێ وەفا بۆ نیشتمان، یانی چی؟ ئەگەر شەوو ڕۆژ، بۆ سەرکەوتنو پێشکەوتنی وڵاتەکەی هەوڵ نەدا!

ئەوانەی لە کاتی خۆشیدا، نیشتمان موڵکی ئەوانەو لە کاتی تەنگانەدا، لەسەر هەژارانو چەوساوانی تاپۆ دەکەن، نازانن نیشتمان، یانی چی!!

ئەوانەی نازانن، نیشتمان، ناسنامەو شوناسو لانەو نەخشەو پێگەی بوونە، نازانن، کوڕی چ وڵاتێکن!

ئەوانەی جگە لە ئەمڕۆ، هیچی دییان بیر نایەت، نازانن، لاپەڕەی مێژووی ئەم گەلە، بە جۆگەلەی خوێنی ڕۆڵەکانی نووسراوەتەوە!

ئەوانەی تەنها، سەرچۆپیی شاییو هەڵپەڕکێ دەگرن.. نازانن، سەرچۆپیگرتن بۆ مەرگ، یانی چی؟!!

ئێمە، نیشتمانێکمان دەوێت، بۆ هەموو ساتەکان، بۆئەوەی هەمیشە، نیشتمانی خۆمان خۆشبوێ، بۆئەوەی هەمیشە بزانین، ئێمە کوردینو کوردستان نیشتمانمانە، بۆئەوەی ئەوانەی تەنها لە بۆنەکاندا، باسی نیشتمانپەروەری دەکەن، موزایەدە بە پیرۆزیی نیشتمانو باوەشی دایکمانەوە نەکەن!

دەمانەوێت کوردستان، هەمیشە بۆ ئێمەو ئێمەش هەردەم بۆ کوردستان بین، لە خۆشیو ناخۆشیدا، لەگەڵیدابینو لەو دیوی سنوورەوە، تەماشای ئازارەکانی نەکەینو هێمن ئاسا، هەمیشە بڵێین:

لە شاییدا، لە وەختی هەڵپەڕینا
لە خۆشیدا، لە کاتی پێکەنینا
لەکۆڕی ماتەمو گریانو شینا
ئەمن ئەی نیشتیمان، تۆم هەر لەبیره
بەشەو تاکو بەسەرما زاڵ دەبێ خەو
بە ڕۆژ تاکوو دوبارە، دێتەوە شەو
لە کاتێکدا، کە دەدوێنم ئەمو ئەو
ئەمن ئەی نیشتیمان، تۆم هەر لەبیره

# کارگێڕی بە گوفتار

کارکردنو هاوسەنگی، باشترین پزیشکی مرۆڤن!!

جان جاک روسو

ئارامیی دەروون، لە کەمیی تاواندایە، ئارامیی جەستەش لە کەمخۆریدایە!

پەندێکی عەرەبی

ژیان بێ سوودگەیاندن، مردنێکی پێشوەختە!

گۆتە

هەموو شتێک تەواو دەبێت، تەنها چاکە دەمێنێتەوە!

پەندێکی فەرەنسی

ئەو کەسەی تامەزرۆی کارکردن بێت، لە یاریکردن زیاتر چێژی لێ دەبینێت!

پەندێکی ئینگلیزی



# گەنجینەکەت بەکاربێنە!!

سی ساڵ بوو سواڵکەرێك لەسەر ڕێیەك سواڵی دەکرد، ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێکی نامۆ بەلایدا تێپەڕیو سـواڵکەرەکەش وەکو نەریتی ڕۆژانەی دەستی سواڵی لێ پانکردەوەو داوای پارەی لێکرد!

کابراش گوتی: شـتێکی وەهام پێ نییـە پێت بدەم، بەڵام پێم ناڵێی ئەو شتە چییە لەسەری دانیشتووی؟

بابای سـواڵکەریش لە وەڵامدا گوتی: ئەوە سندوقێکی کۆنە، لە مێژە ڕۆژانە لەسەری دادەنیشم!

پیاوەکە گوتی: ئایا تا ئێسـتا هەوڵتداوە بیکەیتەوەو بزانی چی لە نێودایە؟!

کابرای سـواڵکەریش لە وەڵامدا گوتـی: نەخێر هەرگیز هەوڵم نـەداوە، چونکە هیچی لـە نێودا نییە، ئەوە جگە لە سـندوقێکی بەتاڵ هیچی دی نییە!

بەڵام لەگەڵ سـوربوونی کابرا لەسەر کردنەوەی سندوقەکە، تا بزانن چی تێدایە کابرای سواڵکەر ڕازیبوو لەسەر کردنەوەی!

بـەڵام کاتێـك کردیانەوە، شـۆك بـوون بەرامبـەری، دەبینن گەنجینەیەکی بەهاداری تێدایە!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:-

١. کابرای سـواڵکەر هەموو تەمەنی بە سـواڵو زەلیلیو دەست پان کردنەوە بردە سەر، لە کاتێکدا لەسەر گەنجینەیەك دانیشتبوو!

٢. بۆ سـەرکەوتن بەسەر ئاسـتەنگو گرفتەکانی ژیاندا دەست لەکەس پان مەکەرەوەو پشت بە گەنجینەی تواناکانت ببەستە.

٣. سـکاڵا لە بەختی خۆت مەکـە، بارودۆخی ژیانت بەرهەمی دەستی خۆتە، بەختیشت، بەرهەمی کارەکانتە، خودا ستەم لەکەس ناکاو ئەوەی ماندوو بێت دەگاتە ئامانج.

٤. هیـچ جیاوازیـەك لە نێوان تۆ و مرۆڤە سـەرکەوتووەکاندا نییە! تەنها ئەوەندەیە کە تۆ ڕازی نابیت جێگاکەی خۆت جێبهێڵی، سەرکەوتووەکانیش لە مێژە هەنگاو دەنێنو قۆناغ بە قۆناغ بەرەو لوتکە دەڕۆن!

٥. سەرەتا داوای یارمەتی لە خودی خۆت بکە، چاوت لە دەستی خۆت بێ، پێش ئەوەی چاوەڕێی دەسـتی مرۆڤێکی وەکو خۆت بی! جگە لە خودا، دەست لەکەس پان مەکەرەوە!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

گەر ناتەوێت سەرکردە بیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

کلیلی سەرکردایەتیی سەرکەوتوو، بریتییە لە: بوونی توانای کارتێکردن، نەك دەسەڵات سەپاندن.

ئەو کەسەی کە هیچ کات پرسیار ناکات، یان هەموو شتێك دەزانێت، یان هیچ شتێك نازانێت!

ئەگەر ئەمڕۆ لە فێرکردن ڕاوەستایت، سبەی لە سەرکردایەتی ڕادەوەستیت.

کارکردنت، دەسەڵاتت پێدەبەخشێت، بەڵام هەڵسوکەوتت، ڕێزگرتنت پێدەبەخشێت.

من لە سوپایەك، کە لە سەد مەڕ پێکهاتووەو شێرێك، سەرکردایەتییان دەکات، زیاتر دەترسم لە سوپایەك، کە لە سەد شێر پێکهاتووە، بەڵام مەڕێك، سەرکردایەتییان دەکات!

ئا: خەندە عوسمان کەریم

بەشی دووەم‌و کۆتایی



## دیدارێك لەگەڵ پرۆفیسۆری یاریدەدەر، بەڕێز: د. ئازاد حمە ئەحمەد شێخانی

# سەبارەت بە پلاندانانی شارو هەرێم

**- ئێستا کۆمپانیایەکی (recycle) هێنراوەتە شاری سلێمانی، بۆ (recycle)ی ئەو خاشاك‌و خۆڵەی کە هەیە، تا چەند ئەو کۆمپانیایە، سوودی دەبێت بۆ شارەکەو میکانیزمی کارکردنی چۆنە؟**

* ئەو (recycle)ە کە هێنراوەتە شاری سلێمانی، تەنها سووتاندنەکەیەتی زیاتر. لە ڕاستیدا پێویستە وزەی کارەباو پەیینی کیمیایی لێ دروووست بکرێت، بەڵام ئەوەی کە من بینیومە، لەو باوەڕەدا نیم ئەو شتانەی لەگەڵدا بێت، تەنها سوتاندنی زبڵەکەیە بە شێوەیەکی جیاوازتر لەوەی ئێستاو ئەو زبڵەی کە هەیە، دەخرێتە کوورەوە، پێویستە ئەو زبڵەی کە هەیە ببێت بە نیعمەت‌و سەروەتێکی ئابوری، چونکە تۆ دەتوانیت دوای ئەوەی دەیسوتێنیت، بەکاری بهێنیتەوە، کرداری سووتاندنەکە کارەبای لێ درووست دەکرێت، هەروەها پاشماوەکەی دەکرێت بە پەیین‌و شووشەو پلاستیکەکانی لێ جیا دەکرێتەوەو دووبارە بەکاری دەهێنرێتەوە، لەگەڵیشیدا دەبێت تەریب بەوە، کارگەیەکی شووشە، یان پلاستیکت هەبێت، بۆئەوەی شووشە، یان پلاستیك درووست بکەیتەوە، لە ڕاستیدا زبڵ دەبێتە نیعمەتێك لە جیاتی نەگبەتی، ئێستا بۆتە نەگبەتی، بێجگە لەوەی بۆ هەر کیلۆیەك لەو زبڵەی بۆت (recycle) دەکاتەوە، نزیکەی (17-15 $) لێ دەسێنێت. لە سلێمانی هەر تاکێك، لە ڕۆژێکدا نزیکەی کیلۆو نیوێك زبڵ بەرهەم دەهێنێت، ئەگەر کەرەتی ملیۆنێکی بکەین، کەواتە ملیۆن‌و نیوێك کیلۆ زبڵت هەیە، ئەمە کەرەتی پانزە، یان حەڤدە دۆلاری بکەیت، بزانە چ بودجەیەکی زەبەلاح دەکات، بەڕاستی ئەمانە، پێویستە بە شێوازێکی نوێ، بیری لێ بکەیتەوە.

**- بۆچی تائێستا پلاندانان بۆ شارەکانمان‌و لەگەڵیشیدا پلانی هەرێمی، جێگای خۆی نەگرتووەو گرنگی خۆی پێ نادرێت، ئایا نەبوونی پلان لەم وڵاتەدا، قازانجی کێی تێدایە؟**

* پلاندانان بە ڕاستی پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیی زۆر گرنگە، لە هەمان کاتیشدا بەڕاستی ڕووبەڕووی کۆمەڵێك خەڵك دەبێتەوە، ڕووبەڕووی هەندێك کەرتی کۆمەڵگا دەبێتەوە، کە بەرژەوەندییان لەوەدایە کە پلان نەبێت، تا قازانج بکەن. بۆ نموونە: تۆ پلان بۆ شارێك دادەنێیت، کە چ ناوچەیەك بکەیتە پیشەسازی، یان خزمەتگوزاری، یان سەوزایی. ئەمە پێشوەخت، پلانی بۆ دادەنێت، ئیتر پلانەکە لە پێنج ساڵی داهاتوودا بێت، یان پانزە، یان بیست‌و پێنج ساڵی داهاتوو، واتە بە پێی پلەی کورتخایەن‌و مامناوەند‌و درێژخایەن، بەڵام کاتێك کە سەرمایەدارێك، دەیەوێت ئەو شوێنە بکات بە هی خۆی، ئەگەر پلانێك هەبێت، ڕێگری لەوە بکات بیکاتە شوقەی نیشتەجێبوون، بۆئەوەی قازانج بکات، بە غیابی پلاندانان ئەم قازانجییەتی، بەڵام خەڵکی گشتی‌و جەماوەر، لێرەدا زەرەرمەند دەبێت، چونکە پلاندانان هەمیشە لە بەرژەوەندیی خەڵکیدایەو لە بەرژەوەندیی کەرتێکدا نییە، وەکو دادوەرێك وایە، لە بەرژەوەندیی هەمووانە، نەك تەنها لە لایەنی هەژارو نە دەوڵەمەند‌و مامناوەند، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی، داکۆکی دەکات‌و ناهێڵێت کەس مافی بخورێت. بۆ نموونە: کاتێك زەوییەك، بۆ پرۆژەیەك دادەنرێت، لەبەرئەوەی پێویستمان پێیەتی، بۆئەوەی خزمەتگوزاری، لەو شوێنە درووست بکرێت، یان باخچەی تێدا درووست بکرێت، یان پیشەسازی، یان هەر چالاکییەکی ئابوری تێدا درووست بکرێت، ئەو شوێنە بکەیت بە شوێنێکی دیکە، بۆ قازانجی کەسێك بێت، بیکات بە یەکەی نیشتەجێبوون، یان بیکات بە سوپەرمارکێت،

یان مۆڵ، ئەمەی تۆ، زیانگەیاندنە بە خەڵك، لەبەرئەوەی تۆ کۆمەڵێك پێوەرت هەیەو پڕنەبۆتەوە، خەڵکەکە پێویستی بە قوتابخانەو سەوزاییو... هتد، هەیە. ئێستا ئەگەر بێیتو ئەم شارانەی کوردستان بەگشتی بیخەیتە ناو چوارچێوەی ستانداردەوە، هەمووی ژێر ستاندەرە. بۆ نموونە؛ هەموو هاوڵاتییەك، بەلایەنی کەمەوە، پێویستی بە ٩م٢ سەوزایی هەیە. ئەگەر سەیری پێوەرەکان بکەیت، هیچی ٩ مەتری بەر ناکەوێت. لەوانەیە (٤-٥ م)ی بەر بکەوێت، هەروەها خزمەتگوزاریی هەر هاوڵاتییەك، نزیکەی (١٣٫٥م) خزمەتگوزاریی پێویستە، ئەم ١٣٫٥م ئەگەر بێتو دابەشی بکەین، ئەگەر دانیشتووانی شارەکەت، یەك ملیۆن کەس بێت، ١٣٫٥ ملیۆن خزمەتگوزاری دەبێت هەبێت، بەپێی ڕووبەری شوێنەکە، بەڵام سەیر دەکەیت، هەمووی بۆتە بینای بەرز، بۆ خزمەتی تاکە کەس، ئەمەش ئەم یەکەو بینایانەی کە دروووست دەکرێن، لە ئەنجامی خستنەڕووو دواکاری (عرض‌و طلب) نییە، هەمیشە کە داواکاری زۆربوو، خستنەڕووش زۆر دەبێت، لێرەدا دەبینین ئەمانە، لە ئەنجامی ئەوەی داواکاری هەبێت، دروووست نەکراون، بەڵکو ئەنجامی ئەوەیە، بۆ قازانجکاری دروووستکراوە، نە بۆ چینی مامناوەندە، نە بۆ چینی هەژار، ئەمە وەبەرهێنانێکە، وەکو بانقێك وایە بۆ ئەو خەڵکەی، کە پارەی هەیەو نازانێت لە کوێ دایبنێت، متمانەی نییە بە بانق، ناچارە بیخاتە ئەم وەبەرهێنانەوەو لە داهاتووشدا، نرخەکەی بەرزدەبێتەوەو قازانجی لێ دەکات، لە ڕاستیدا زەویی مافی هاوڵاتییەو پێویست بوو بۆ پڕکردنەوەی خزمەتگوزاریو ئەو پێوەرانەی کە هەن، بەکاربهێنرێت، بەڵام بە غیابی پلانەر، دراوە بە کەسێك کە بۆ قازانجکاری بە کاری بهێنێت.

**- لە ڕابردووداو ئێستاش کۆمپانیاکان دەهێنرێنرێن بۆ دانانی ماستەرپلان بۆ شارەکانمان، هۆی شکستهێنانی ئەو پلانانە چییە کە دایدەنێن؟**

* لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان زۆرجار ئەو کۆمپانیایەی کە دێت، کۆمپانیای پسپۆڕ نینو لە پلاندانان پسپۆڕ نین کۆمپانیایەکی کارەبا، یان دروووستکردنی بەنداوە، چونکە پسپۆڕییەکەی نازانین، یان کاری لێکچووی ئەو کۆمپانیایەیان داوا نەکردووە، ئێستا وا خەریکن داوا دەکەن لەو کۆمپانیایە، کارەکانی پێشوتریان، لەو بوارەدا، پیشان بدات. دووەمیان ئەگەر پسپۆڕیش بێت، دیسانەوە لەگەڵ جەماوەردا، پەیوەندییەکی کەم هەیە، دەبێت لە ماوەی سیازدە مانگدا تەواو ببێتو هەر پێنج قۆناغەکە لە سیازدە مانگدا زۆر کورتە، ئینجا بابەتی پارە دێتە پێشەوە، پارەیان وەرنەگرتووە، یان بۆ کۆکردنەوەی داتاکان، لەو ماوە دیاریکراوەدا، کارمەندیان ئەوەندە نەگرتووە، یان لە کۆکردنەوەی داتادا، کەمتەرخەمییان کردووە، لەبەرئەوەی بەرامبەرەکەش نەیزانیوە، کە دەبێت ئەو کۆمپانیایە، چی بکاتو گرنگیی داتاکان چییە، گرفتەکە لەوەدا دەبێت، کە ماستەرپلانەکە دروووست دەکات پێنج قۆناغی بۆ دروووست دەکاتو ڕەنگاوڕەنگو بریقەداری دەکات، بەڵام ناوەڕۆکەکەی ئەوە نییە، کە ئامانجەکەی پێکابێت.

**- ئایا بوونی نەوت لە هەرێمی کوردستانداو بوونی ئەو بودجە زۆرەی نەوت، بەشێوەیەکی گشتی پاڵنەرێك بووە بۆ گەشەپێدانی مرۆییو بۆ گەشەسەندنو بەرەوپێشچوونی پلان، یان ڕێگریو بەربەستی زۆری دروووست کردووە بۆ پلاندانان؟**

* دواهەمین توێژینەوە کە کراوە، تاقیکردنەوەی (PISA) لە ڕێکخراوی (OECED) ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئابووریو کۆمەڵایەتییە، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، تاقیکردنەوەیەکی کردووە. خوێندکاری ٦٥ وڵات، بەشداری لەم تاقیکردنەوەدا کردووە لە بابەتەکانی بیرکاریو زانست... هتد، تا بزانێت ئاستی زیرەکییان چەندە، دەرکەوتووە ئەو وڵاتانەی کە نەوتیان هەیە، لە هەموویان خراپترنو ئەو وڵاتانەی سامانی سروشتییان نییە، یاخود کەمە، لە هەموویان زیرەکترنو وڵاتی تایوان هەموو ساڵێك پلەی یەکەم بەدەست دەهێنێت، لە کاتێکدا وڵاتی تایوان سەرچاوەی سروشتیی سفرە، واتە هیچی نییە، چونکە مرۆڤەکانی پێ گەیاندووەو بیر لە داهێنان دەکەنەوە، تەنها دوو وڵات نەبێت لە نەوتدارەکان، توانیویانە ئاستێکی بەرز بەدەستبێنن، ئەویش نەرویجو کەنەدایە، کە ئەو نەوتەیان بەکارهێناوە، بۆ گەشەپێدانی مرۆییی وڵاتەکەیان.

**- بەڕێزتان لەگەڵ چەند مامۆستایەکی دیکەدا، بەشێکتان کردەوە لە زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی، بە ناوی پلانسازیی شارو هەرێم، بیرۆکەی ئەمە چۆن بوو، بەرنامەو پرۆگرامی خوێندنی بەشەکە چی بوو؟**

* لە دوای ساڵی (٢٠٠٤) بەشێکمان دامەزراند کە تاکە بەشە لە عێراقدا هەیەو لە شاری سلێمانیدایە، بەناوی بەشی (پلانسازیی شار). ئەمە وەکو وەڵامێك بوو، بۆ ئەو نارێکوپێکییەی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، چونکە بەبێ پلاندانان، هەموو شتەکان بە شێوەیەکی زۆر نارێك دەڕواتو ئەو بودجەیەی کە هەتە، بە هەدەر دەڕواتو ناتوانین بە باشی سوودی لێ وەربگرین، ئەگەر پێشوەخت دیزاینی بۆ نەکرێت، کە دەتەوێت چی بکەیتو چی نەکەیت، بۆ داهاتوو چی دەکەیت. ئەمە کە لە هەرێمدا هاتەکایەوە، لە کۆلێجی تەکنیکی سلێمانی، زۆربەی بەرنامەکەشی لە (ئیتالیا)وە هاتبوو، تاکە بەشبوو لە عێراقدا، ئەو کاتە مامۆستای پسپۆڕمان نەبوو. بە یەکەوە لەگەڵ کۆمەڵێك مامۆستای دیکەدا، توانیمان ئەو وانانە بڵێینەوە، لەبەرئەوە مامۆستامان لە باشووری عێراق لە بەغدادو کەرکوك دەهێنا، بۆئەوەی بەشەکە نەمرێت. چونکە پلانەر، ئەو کەسەیە بتوانێت کۆنترۆڵی هەموو ئەو زانستانە بە یەکەوە بکات لە شوێنێکدا، ناتوانیت تەنها تۆ ئەندازیاری تەلارسازی بیتو پلان دابنێیت، چونکە ئەگەر باکگراوندێکی (ئابووری- ئامار- کۆمەڵناسی- جوگرافی...)، نەبێت تۆ ناتوانیت ببیتە پلانەرێکی سەرکەوتوو، ئەمانەن خاڵەکانو تووشی زۆر گرفتی گەورە بووینەوە لەوەی کەس نییە پسپۆڕ لەم بوارەدا، چونکە ئەمە یەکەم جارە لە عێراقدا دروووست بێت، جابۆیە مامۆستاو ئەمانە دەبوایە خۆمان سەرچاوەی پێ بدەینو لەو سەرچاوەیە لێی تێبگاتو بە خوێندکارەکانی بڵێتەوە، یان من خۆم هەندێ سەرچاوەی باشم هێنابووەوە بە زمانی ئینگلیزی بوو، ئەو کاتە بە هەندێك مامۆستام دەدا، تا سوودی لێ وەربگرن، چونکە ئەو سەرچاوانە بوونیان نییە لە عێراقدا. جا بۆیە تا ئاستێك دەتوانم بڵێم توانیمان کارەکە، بەباشی بەرینە پێشەوە.

سوپاس بۆ بەڕێز.. پرۆفیسۆری یاریدەدەر، دکتۆر ئازاد شێخانی..

*** کۆکردنـــەوە بەشـــێوازی ئامار(طريقة التجميـــع الإحصائي):-** شـــێوازێکی نوێیە، لـــە دەرکردنی بڕیـــاری کارگێڕی بەشـــێوەیەکی هاوبەش، ئەم شـــێوازە بۆ چارەسەری چۆنێتیی کێشە کارگێڕییەکان گونجاوە، وەك خەملاندنی بەرهەمە فرۆشـــراوەکانی ڕێکخراوەیەك، یان خەملاندنی تێچوونی بەرهەمێکی دیاریکراو، یان کۆمەڵە کەسێك، پرسیار لەبارەی گریمانەی کێشەیەکی دیاریکراوەوە دەکەن، بۆچوونی کەســـەکان کۆدەکرێتەوە، پاشان ڕێژەی چەندێتیی ئەو کێشەیە، یان دیاردەیـــەی بە یەکێك لە ڕێگا ئامارییەکان؛ وەك: ناوەندی ژمێرەیی (الوســـط الحسابي) یان (الوســـيط) دەردەکرێت، ئەوەی لەم شێوازەدا تێبینی دەکرێت، کەسەکان ڕووبەڕووی یەکدی دانانیشن، ئەم شێوازە، تایبەتمەنـــدە بەوەی بیرکردنەوەی بەکۆمەڵـــی تێدا نییە، هەروەها تەنها لە چارەســـەرکردنی چەند ئاریشەیەکی دیاریکراودا بەکاردێت، هەروەها ئەوەی شیاوی بیرهێنانەوەیە، لەم شێوازەدا ئەوانەی بڕیار دەردەکەن، پەیوەندی لە نێوانیاندا نابینرێت.

*** کارگێڕی ناوچەیی (الإدارة المحلية):-** شێوازێکە لە شێوازەکانی بەڕێوەبـــردن، بە گوێرەی ئەم شـــێوازە، لـــە ڕووی بەڕێوەبردنەوە، هەرێمێك لە هەرێمەکانی دەوڵەت، بۆ چەند ناوچەیەکی خۆجێیەتی دابەشـــدەکرێت، هەر ناوچەیەك، کەســـێتییەکی جێبایەخی هەیە، ئەنجومەنێکـــی هەڵبژێردراو، لەلایـــەن خەڵکی ناوچەکەوە، لە ژێر سەرپەرشتیارو چاودێری حکومەتی ناوەنددا، نوێنەرایەتیی دەکات.

نوێنەرانی ئەنجومەن، بە هـــۆی هەڵبژاردنیان لەلایەن خەڵکی ناوچەکەیانەوە، کە لە جێبەجێکردنی ئەرکو پسپۆڕێتییەکانیاندا، ئازادیی تەواویان هەیە.

لە دابەشـــکردنی هەرێمەکاندا، وڵاتان چوونیەك نین، دیارترینیان شـــێوازی فەرەنســـییە، کە وڵات بۆ چەند یەکەیەکی یەکگرتوو دابەش دەکات، کە هەریەکەیان نوێنەرایەتی تەواوی هەرێمێك دەکات، بە پێی نموونەی فەرەنســـی، گشت هەرێمەکان لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە دابەش دەبن بۆ ســـێ ئاستی بەڕێوەبردن، ئەوانیش: هەرێم، پارێزگا، شارەوانی، ئەم شێوازە، لەسەر بنەمای یەك شێوازی ڕێکخستنو بەڕێوەبردنی یەکە کارگێرییەکان بنیادنـــراوە، لە بواری پەیوەندی بە حکوومەتی ناوەندو دابەشـــکردنو ئاشـــکراکردنی دەســـەڵاتەکانی بەڕێوەبردنەوە، بەدەر لە بارودۆخی ناوچەیی، ئاســـتی دارایی، ژمارەی دانیشـــتوان، بەڕێوەبردنی خۆجێیەتی، جیاوازە لە سیستەمی فیدراڵی، دەسەڵاتەکانی ئەندامان لە سیستەمی فیدراڵیدا، کەمتر نییە لە دەسەڵاتەکانی حکوومەتی ناوەندی، یـــان حکوومەتی فیدراڵی، چونکە لە ڕووی یاســـاییەوە، دەســـەڵاتەکان هاوشێوەی دەسەڵاتی دەزگاکانی حکومەتی ناوەندین، هەروەها دەسەڵاتی ئەندامانـــی هەرێمەکان، لە کاتی جێبەجێکردنیاندا، ناچێتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی ناوەندییەوەو پشتی پێنابەستێت.

بـــەڵام دەســـەڵاتی بەڕێوەبەرایەتییـــە خۆجێیەکان، پشـــت بەدەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی دەبەستن، هەروەها حکوومەتی ناوەنـــدی، چوارچێـــوەی کاری دەســـەڵاتی بەڕێوەبەرێتییـــە خۆجێییەکان دیاری دەکات.

بـــەم شـــێوەیە بەڕێوەبەریتییـــە خۆجێیـــەکان، جیـــاوازن لە دابەشکردنی لقەکان «لقەکارگێڕییەکان»و شوێنی بڵاوبوونەوەیان، لـــە پارێـــزگاو شـــارو دێهاتەکانـــدا، بـــەڵام شـــێوازی بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەرێتییـــە خۆجێیـــەکان، بڕێـــك ئازادی «ئەگـــەر کەمیش بێت» دەدات بە پارێزگاو شـــارو دێهاتـــەکان، لە بەڕێوەبردنی کارە تایبەتییەکانیان لەو جێگایانەدا.

*** ژێرخـــان (بنية تحتية):-** ژێرخان لە پـــرۆژەکان، یان لە کارگێڕی حکوومیـــدا، ئـــەو پێکهاتەیەیـــە، کـــە خزمەتگوزارییـــە بنەڕەتییەکان بۆ ئابووریـــی نەتەوەیـــی دابیـــن دەکات، وەك: ڕێگاوبانـــەکان، کەنـــارەکان، تۆڕەکانی کارەبا، ئاوو نیشتەجێبوون، گواستنەوەو بەنداوەکان، خوێندنگەو نەخۆشـــخانەکان، هەموو ئەوانەی ناویانهێنرا، ســـەرمایەو ڕێژەی گشتیی تێچوون زیـــاد دەکەن، گرنگیی تایبەتیی خۆیـــان هەیە؟! چونکە چالاکیی ئابـــووری، ناتوانێت دەســـتبەرداریان بێت. بەرامبەر بەژێرخان، ســـەرخان هەیە، ئاماژەیەکە بۆ گشـــت دیاردە هزریو ئاکارییەکان، یاخود هەموو ئەو ڕەهەندانەیە، کە لە کۆمەڵگادا، لەســـەر ئاســـتی ڕامیاریو هزری درووست دەبـــن، دەرکەوتنی ئەو ڕەهەندانە، بەپێی ئاســـتی دەوڵەتو ئایدۆلۆجیای دەوڵەت دەبێت، یاخود لەســـەر ئاســـتی دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت، یان لەسەر ئاستی ئەو بیروباوەڕو ئایدۆلۆجییانەی، کە کۆمەڵگا هەڵدەسووڕێنن.



# زاراوەی کارگێڕی

و. وەهاب حەسیب محەممەد

# ژیانت ڕێك بخە!

ڕابەر ئەحمەد وەرتی

ژیانت ڕێك بخە؛ واتا خۆت ڕێك بخە، خۆت کۆ بکەرەوە، وەرەوە سەر خۆت.. خۆتو کەلوپەلەکانت پۆشتەو ڕێکوپێك بکە. بوونەوەرەکان، بەتایبەتی مرۆڤ، چەندە جوانن، کاتێك گرنگی بە خۆیان دەدەن، ناشیرینییەکان جوان دەکەنو جوانییەکانیش جوانتر دەکەن، سیمایان لە ژیاندا، جوانتر دەردەکەوێت!

کەواتە: ئەگەر پۆشتەش بیت، پێویستە پۆشتەتر بیت، پێویستە ئیدی ژوورەکەت، زیاتر ڕێك بخەیت، شوێنی کارەکەت جوانتر ڕێك بخەیت، ئۆتۆمبێلو ڕوخسارو ناخت خاوێن بکەیتەوە، کە دەچیت بۆ شوێنێك، پۆشاکی ڕێك بپۆشیت. جیهانی تۆش خەونەکانتە، کاتێك سەردانی هەندێك کەس دەکەیت، دەبینیت بەهۆی وێڵبوونی بە دوای هیواکانیدا،ماڵەکەیو شوێنی کارکردنی بێسەروبەرەن! هێندە بەدوایانەوە بووە، بیری چووەتەوە خۆڕێکخستنو خۆپۆشتەکردن، هەنگاوێکە بۆ پێشەوە.

بۆچی کاتێك میوان، تەلەفۆنمان بۆ دەکات، ئەو کات ماڵەوەمان ڕێکوپێك دەکەینو کۆی دەکەینەوە؟! کە دەبینرێین، جلێکی ناڕێکمان لەبەردایە، هەمیشە بیرو هۆشمان شڵەژاوە؟! دڵمان لە شوێنی خۆی نییە؟! بۆچی هێشتا هەندێکمان بڕیارمان نەداوە کە چۆن بژین؟! لە پێناوی کێدا بژین؟! ئامانجی ژیانمان چی بێت؟! بۆچی هەتا نینۆکەکانمان زۆر درێژ نەبن نایانقرتێنین؟! تا قژمان زۆر ئاڵۆز نەبێت ڕێکی ناخەین؟!

چاوەکانت بکەرەوەو بیرکەرەوە، واز لەمە بهێنە، کە تا چەند سەرقاڵیت، واز لەخەمەکانیش بهێنە، گەر بۆ ئەم چەند ساتەش بێت، بزانە پەرتو بڵاوییەکەت، لە چیدایە؟ بگەڕێ بەدوایاندا، بڕۆ کتێبەکانت کۆ بکەرەوەو بەجوانی دایانبنێ، جلە پاکو پیسەکان، لێك جیابکەرەوە، بیری ئەوەش بکەرەوە، کاتێك لە خەو هەڵدەستیت، ئاخۆ جێگاکەت کۆ دەکەیتەوە؟ بزانە ددانەکانت پاکن؟ قژت ڕێکە؟ کۆمپیوتەرەکەت، تۆزی لەسەر نەنیشتووە؟

خوێنەری ئازیز.. نەك کەلوپەلو پۆشاکو کتێبخانەکانمان، بەڵکو تەنانەت پێویستە، بیرو هۆشیشمان کۆ بکەینەوە. دەی ئیدی ترسو بێهیوایی لەگۆڕ بنێ، دەست بکە بە بەرهەمەکانت، چالاکییەکانت، دڵسۆزییەکانت، خۆشەویستییەکانت، دەست بە هەموو شتێکی نایابی ئەم ژینە بکە. چەندان پڕۆژەت هەن، تەواوت نەکردوون، پێویستە تەواویان بکەیت، دەبێت ئیدی کاتت لا بەنرخ بێتو بە شتگەلێکی بێنرخ نەیفرۆشیت، یان لە دەستی نەدەیت، پێویستە ئیدی ئامۆژگارییەکانی خەڵکی جێبەجێ بکەیتو هی خۆشت بەتەواوی لە ژیانتدا ڕەنگ بداتەوە، ئەو ڕەخنانەی لێیان گرتوویت، قبوڵیان بکەیت، پێویستە ئیدی کاربکەیتو سبەیو دووسبەی کە ڕۆیشتی، جێدەستت دیاربێت، جا لە ڕووکەش، یان ناوەڕۆك، چیدی پێویست بە دوژمنایەتیو ناکۆکی کەسێك، یان شتێك ناکات، ئەمە تەنها لەدڵڕەقیت بووە، ئێستا تۆ خاوەنی دڵێکی گەورەترو بە ئەوینتریت، چیدی ڕق قەبوڵ مەکە، ئیدی پێویستە بەیەکجاری، ببیت بە بەڕێوەبەری ژیانی خۆت، لێپرسراوی کارەکانی خۆت، لەمەودوا پێویستە بۆ سەرکەوتنی کارەکانت، زیاتر ڕاوێژ بەکار بهێنیت، ئیدی با بەس بێتو دەست بکە بە بەجێهێنانی ئەو بەڵێنانەی کە بە میللەتەکەت، کرێکارەکانت، منداڵەکانت، هاوسەرو دەوروبەرت داوە، ئیدی دەموچاوت بەرەو خەندە بگۆڕە، ئیدی هەر دەبێ بەڕاستی ژیانت ڕێکبخەیتو دەست بە ژیانی تازەت بکەیت!

ڕابردوو؛ ئەوە بوو کە تێیدا لەدایکبووین، گەورە بووین، ئەمڕۆش؛ ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا ژیانمان ڕێك بخەینو دەستی پێ بکەین، سبەیو دووسبەیش، ئەم جیهانە بەجێ دەهێڵین، با کە دونیا جێ دەهێڵین، شتێکمان لەدوای خۆمان جێ هێشتبێت، کە سوودی بەردەوامو نەبڕاوەی هەبێت، تا بەهۆیەوە لای خەڵكو نزاکانیان لەبیر نەکرێین.

دەبینین هەندێ کەس، تەمەنێکیان تێ پەڕاندووە، بەڵام بیر لە خۆڕێکخستن، یان دەستپێکردن بە ژیان ناکەنەوە! دەزانم کە لەوانەیە، هەندێ کێشە، یان هەندێ خەم هەبن، کە ئازارمان بدەن، بەڵام ئەمانە، نابێت ببن بە لەمپەر لە بەرەوپێشچوونی ژیانمان، لەوانەیە هەندێ کار هەبن، کە کاتی زۆرتان بۆیان تەرخان کردبێتو هێندەش گرنگ نەبن.. بەڵام هەر وەکو وتراوە: (ناتوانیت ئەو کەسە لەخەو هەڵبسێنیت، کە خۆی لەخەو ناوە!)



# گرنگیی جانتای قوتابخانە

هەڵبژاردنی پێداویستییەکانی خوێندن بۆ منداڵان، پێویستییان بە لێزانی هەیە، لەبەرئەوە دەبێت سەرنجو وردەکاریی زیاتر، لە کاتی هەڵبژاردنو کڕینیاندا، بەکاربهێنین، بەتایبەتی جانتای قوتابی، کە گرنگییەکی زیاتری هەیە، چونکە هەڵبژاردنی نادرووستی جانتا، زیانێکی زۆری بۆ سەر لەشو دەروونی منداڵان دەبێت. ڕەچاوکردنی ئەم چەند خاڵە پێویستە:-

* بە هیچ شێوەیەك جانتای تایە، بۆ قوتابیی قۆناغی سەرەتایی مەکڕن، ئەم چەشنە جانتایانە چەند کەموکوڕییەکیان هەیە:-

١- جانتای تایە، لە نێو مێزی خوێندنی قوتابخانەدا، بەئاسانی جێی نابێتەوەو بۆ قوتابییش، دەبێت بە هۆی کێشە.

٢- جانتای تایە، بە هۆی ئەوەی منداڵان بە سەر زەویدا دەیخشێنن، مەرجی تەندرووستی تێدا نییەو دەبێت بە هۆی هەلگرتنو گواستنەوەی ڤایرۆسو میکرۆب، بۆ نێو ماڵو پۆلەکان. (لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جۆرە جانتایانە بۆ ڕێگرتن لە ئێشو ئازاری ناو قەدو بڕبڕەی پشت، بۆ منداڵ گونجاوترە.)

٣- باشترین جۆری جانتا بۆ منداڵ، لە جۆری جانتای شانو کۆڵەپشتە، هەوڵ بدەن هەر ماوەیەك، جارێك کورتو درێژی دەسکی جانتاکانی شانو کۆڵ، ئەندازە بکەن، تا نەبێت بە هۆی ئازاری کەمەرو پشتی خوێندکار.

٤- باشترین شێوە بۆ ڕێگرتن لە ئازاری کەمەرو تێکچوونی شێوەی شانو ملی قوتابی، لە کاتی بەکارهێنانی جانتای کۆڵەپشتدا، ئەوەیە کە دەسکەکانی جانتایەکە، بە جۆرێك ڕێکبخرێت، کە قورساییی جانتاو کتێبەکان، لە سەر بەشی خوارەوەی کەمەرو کەمێك نزیك لە سمتی منداڵەکە بێت.

٥- ڕەنگی جانتا، دەتوانێت کاریگەریی لەسەر ئەندازەی کەیف خۆشیو ئارەزووی منداڵاندا هەبێت، باشتر وایە، منداڵانی قۆناغی بنەڕەتی، بە تایبەتی پۆلەکانی سەرەتا، ڕەنگی کراوەو شادیبەخشیان بۆ بەکار بێت.

٦- ئەو جانتایانە بۆ منداڵەکانتان هەڵبژێرن، کە تایبەتمەندیی چەند گیرفانو شوێنی جیاو جیاوازیان هەیە، بۆئەوەی بتوانرێت پێداویستییەکانی قوتابخانەو خۆراکی تێدا بەجیا هەڵبگیرێت.

٧- ئەو جانتایانە بۆ منداڵەکانی پۆلەکانی سەرەتای خوێندن مەکڕن، کە لە کاتی بەکارهێنانیاندا، وشەی نهێنییان دەوێت، چونکە دەبێت بە هۆی کێشەو گرفتاری بۆ خۆتانو مامۆستایان، هەروەها خودی منداڵیش، لە ماڵەوەو قوتابخانەدا.

٩- جانتای دەستی، هەلگرتنی بەبەردەوامی، دەبێت بە هۆی تێکچوونی شێوەی دەستو شانی منداڵان.

١٠- جانتای چەرم، بەتایبەت ئەوانەی کە جۆری چەرمەکەیان، باش نییەو بە هۆی تینی خۆرەوە، بۆنێکی ناخۆشیان لێ دێت، دەبێت بە هۆی سەرئێشەو کزانەوەی چاوی منداڵان، کە ئەمەش، دەبێت بە ڕێگر لە بەردەم فێربوونی بابەتەکاندا، چ لەنێو پۆلدا بێت، چ لە ماڵەوەدا.

١١- پێویستە لە قوتابخانەکاندا، جێگایەکی تایبەت بۆ هەلگرتنی کتێبو دەفتەری ڕاهێنانو هەندێ کەلوپەلی دیکە، کە لە ماڵەوە بە کارنایەن، ئامادە بکەن، تا خوێندکاران ناچار نەبن، هەموو ڕۆژێك جانتاکەیان بە قورساییەکی زۆرەوە هەڵبگرن.

١٢- هەوڵ بدەن هەفتەی جارێك، جانتای منداڵەکانتان لە بەر تیشکی خۆردا دابنێن، تا میکرۆبو بەکتریای نێویان نەمێنێت.

١٣- وێنەی سەر جانتاکانیش، هۆیەکە بۆ لادانی زەینو هۆشی منداڵەکان لە پۆلدا.

تایبەتمەندی (کۆڵەپشت)ێکی گونجاو بۆ قوتابی:-

ئەوەی کە ئەندازەو کێشی کۆڵەپشت دیاری دەکات، تەمەنی کەسەکە نییە، بەڵکو لەشولاری کەسەکەیە. بەکارهێنانی کۆڵەپشتی گەورەو قورس، لە کۆتاییدا گرفتی زۆر دەهێنێتە ئاراوە، لە تێکچوونی شێوەی پشتەوە بگرە، تا زیان پێگەیشتنی ئەژنۆکانو هێنانە کایەی کەموکوڕی لە گەیشتنی خوێن بۆ دەستەکان، بۆیە بەر لە کڕینی (کۆڵەپشت)، ئەم چەند خاڵە لەبەرچاوبگرن:-

ئەندازە:- کۆڵەپشت، دەبێت بە ئەندازەیەك بێت، کە لە نێوان کۆتایی ملو کۆتایی کەمەردا بێت، هەروەها دەبێت دەسکەکانی پان بن، تا بەئاسانی، لە سەر شان بوەستێت.

پشتێنی کەمەر:- کۆڵەپشتێك هەڵبژێرن، کە پشتێنی کەمەری هەبێت، کە لە کاتی لەکۆڵکردنیدا، لە ناوقەددا ببەسترێت، تا بە هۆیەوە، ئەو فشارەی دەکەوێتە سەر کەمەر، کەم ببێتەوە.

کێشی کۆڵەپشت:- نابێت کۆڵەپشت زیاد لە ئەندازە، قورس بێت.

درەخشان بەهادین



# مافو ڕەوشی منداڵ لە سەر ئەرزی واقیع

## بەشی دووەمو کۆتایی

حسین نجم الدین قەرەداغی

ئەمە بەشێکی گرنگیی ئەم بابەتەیە، کە زۆربەی شتەکانی دیکەیش لە ڕوانگەی تیۆریو دەقی ناو جاڕنامەو نوسراوو پەرتوکەکانەوە، جوانو بریقەدارە، بەڵام لە زەمینەی ژیاندا، شتێکی دیکە دەگوزەرێت، کە هەندێجار، وەك جیاوازیی (ئاسمانو ڕێسمانە). بەگشتی لەسەر ئاستی جیهانیشدا، ئەو داتاو ئامارانەی لەبەردەستدان، بەداخەوە ئەرێنیی نییە، ئەوەتا ڕێکخراوی (یونیسێف)، لە ڕاپۆرتی تایبەت بەو بوارەدا، دەڵێت: لە جیهاندا، ساڵانە زیاتر لە (٣٠٠) ملیۆن منداڵ، دووچاری خراپیی مامەڵەو خراپ بەکارهێنان دەبنەوە، ئەو منداڵانەی کار دەکەن، لە هەر ٦ منداڵێك، ١ منداڵی ئیشکەر هەیە، واتە ٦/١، بە شێوەیەکی گشتی (١٥٪-٣٠٪) لە وڵاتاندا تۆمارکراوە.

لە هەرێمی کوردستانیشدا، هەرچەندە داتای ورد، لەبەردەستدا نییە، بەڵام ئەوەی کە نیشاندراوە، ئاماری ساڵی ٢٠٠٧ی ڕێکخراوی منداڵپارێزی کوردستانە، کە تێیدا نیشان دراوە، (١٤٠٠٠) چواردە هەزار منداڵ، کە تەمەنییان لە خوار پانزە ساڵییەوەیە، لە هەر سێ پارێزگاکەی هەرێم کاردەکەن، کە ئەمە پێچەوانەی مافی منداڵە، وەك لە جاڕنامەی مافەکانی منداڵدا هاتووە، لە ئاماری کۆڕبەندی یاسایی عێراقدا هاتووە: لە ساڵی ٢٠١٠و لە هەرێمی کوردستاندا، (١٢٤٠٠) منداڵی ئیشکەر هەیە.

هەرچەندە پاش ساڵی ٢٠٠٥و باشبوونی باری دارایی بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستانو بوونی ئارامیو ئاساییش لە هەرێمی کوردستاندا، ڕەوشی منداڵ، بە بەراورد بە بەشەکانی دیکەی عێراقو هەندێ وڵاتانی دراوسێ باشترە، بەڵام هێشتا لە ئاستی پێویستدا نییەو ڕۆژانە دەستو پەنجە لەگەڵ بەشێك لەو گرفتو ناتەواوییانە نەرم دەکەین، کە بەکورتی بریتین لە:-

١- هێشتا ژمارەیەکی بەرچاو لە منداڵان، واز لە خوێندن دەهێنن، یان ناچار دەکرێن واز لە خوێندن بهێنن، لەبەر نەبوونو کەمیی ڕۆشنبیری، یان سەرچاوەی بژێویی خێزانەکانیان، کە ناچار دەکرێن هەر لە تەمەنی منداڵییەوە، عەلاگەفرۆشی، یان کاری شاگردی...هتد، ئەنجام بدەن، کە زۆرجار ئەو کارانە، لەگەڵ باری تواناای لاشەییو پەروەردەییاندا نایەتەوەو لە ئەنجامدا دەبن بە هۆی خراپ پەروەردەبوونو بەرهەمهێنانی ناباش.

٢- بۆنەو یادی منداڵان، بە خەمساردی تێپەڕ دەکات، وەك ئەمساڵ بە بیانووی نەبوونی بودجەو قەیرانی دارایی دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەت، وەك پێویست لە خەمی ئەو یادەدا نەبوون، یان بەشێوەی تەقلیدی منداڵی بەرپرسو نزیك لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بە جلوبەرگی ئاڵوواڵاوە نیشاندەدرێن کە ڕەنگە زۆربەی ڕۆژەکانی ژیانیان، هەر بەوشێوە بێت، بەڵکو پێویستە زۆرترین بەشداربوون، بۆ مناڵانی هەژارو شوێنە دوورە دەستو بێبەشەکان بێتو ئیدی مرۆڤە گەورەکان، لەبری مناڵەکان قسە نەکەن، بەڵکو گوێیان لێبگرن، تا لێیان تێبگەنو بە تواناو خواستەکانیان ئاشنا ببن، تا بتوانین ئاڕاستەیەکی درووستیان بکەینو خزمەتی ئایندەی نیشتمانیان پێ فەراهەم بکەین.

٣- لاوازی ڕۆڵی وەزارەتو دەزگا پەیوەندیدارەکان، بەتایبەت وەزارەتەکانی ئەوقافو ڕۆشنبیریو پەروەردە، کە هەماهەنگییان لە نێواندا نییە، یان لە ئاستێکی زۆر لاوازدایە، بۆ سوودوەرگرتن لە پشووی هاوینو پەروەردەبوونو فێربوونی زانستی نوێو ئاشناکردنیان بە خوێندنەوەو خولی جۆراوجۆر، بۆ پەرەپێدانی تواناکانیان، کە سامانێکی گەورەی مرۆییو دەرفەتێکی زۆرو تواناو لێهاتنی باش، بۆ پەروەردەکردنو فێرکردنیان هەیە، بەڵام بەهۆی لاوازیی میکانیزمو هاوکاریی لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە، هەموویمان بەدەستی قەدەر سپاردووە. لە هەمان کاتدا چاوەڕێی بەرهەمی باش دەکەین، هەموو ئەو ئەرکانە کەوتوەتە سەر شانی خێزانەکان، کە ئومێدمان وایە، خێزانو ئەندامانی خێزان، بتوانن ئەو ئەرکە گرنگە ئەنجام بدەنو ئەو بەرهەمە بگەیەننە کەناری ئارامی.

# ڕاڤەکردنی دەستەواژەی بازاڕسازی بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز

ئا: وەهاب حەسیب محەممەد

* کاتێك کیژێکی زراڤ دەبینیت لە ئاهەنگێکدا، لێی دەچیتە پێشو دەڵێیت: من کەسێکی زۆر زەنگینم، شووم پێدەکەیت، ئەوە بازاڕسازییە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

* کاتێك لە ئاهەنگێکدایت، لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێکانتدا، کیژێکی جوان دەبینن، لێی دەچنە پێشو ئاماژە بۆ تۆ دەکەن، دەڵێن ئەو پیاوە دەوڵەمەندە، ئامادەیت ببیت بە هاوسەری؟ ئەوە بانگەشەو ڕاگەیاندنە.

* کاتێك لە ئاهەنگێکدا، کچێکی شۆخ دەبینیت، نزیکی دەبیتەوەو ژمارەی تەلەفۆنەکەی لێوەردەگریت، ڕۆژی دواتر پەیوەندی پێوە دەکەیت، دەڵێیت: من پیاوێکی سەرمایەدارم، ئامادەی ببیت بە هاوسەرم، ئەوە بازاڕسازییە لە ڕێگەی تێلەوە.

* لە زەماوەندێکدا، کاتێك کچێکی قەشەنگ دەبینیت، دواتر لێی نزیك دەبیتەوە، بۆینباخەکەت ڕێك دەخەیت، شەربەتێکی پێشکەش دەکەیت، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەتی بۆ دەکەیتەوە، جانتاکەی بۆ هەڵدەگریتو پێیدەڵێت، بەندە کەسێکی بەتوانایە، (ببورە) دەتەوێت ببیت بە هاوسەرم، ئەوە پەیوەندیی گشتییە.

* لە ئاهەنگێکدایت، کیژێکی نەشمیل نزیکت دەبێتەوەو پێت دەڵێت: تۆ کەسێکی دەوڵەمەندیت، ئامادەیت بمکەیت بە هاوسەرت، ئەوە نیشانەی بازرگانییە، (گرنگیدانە بە نیشانەی بازرگانی).

* کاتێك لە ئاهەنگێکدایت، کچێکی جوان دەبینیت، لێی دەچیتە پێشەوەو دەڵێیت: من کەسێکی دەوڵەمەندم، شووم پێدەکەیت، کاتێك دەزانیت بەزللەیەك، ڕووت سوور هەڵدەگەڕێنێت، ئەوە تێبینییەکانی هەمیشەکڕیارە.

* لە زەماوەندێکدا، کچێکی زراڤ دەبینیتو لێی دەچیتە پێشەوەو دەڵێیت، کەسێکی بەتوانام ئامادەیت، ببیت بە هاوسەرم، ئەویش (بەشێوازی تایبەتی خۆی)، بە کەسێکت دەناسێنێت، کە ئەوە (هاوسەرەکەیەتی)، ئەوەش دەلاقەی (بۆشایی) نێوان خواستو خستنەڕووە.

* کاتێك لە ئاهەنگێکدا، کیژێك دەبینیت، پێش ئەوەی نزیکی بیتەوە، کەسێکی دیکە پێشت دەکەوێتو دەیداتە بەر دەم ڕێژنەی قسەو پێی دەڵێت: من کەسێکی دەوڵەمەندم، شووم پێدەکەیت، کیژەکەش ڕازی دەبێتو لەگەڵیدا ڕێك دەکەوێت، ئەمکارە واتای ئەوەیە، ڕکابەری بازاڕ، پشکی تۆی کەم کردۆتەوە.

* کاتێك لە ئاهەنگێکدا، چاوت بە کچێکی جوان دەکەوێت، پێش ئەوەی پێی بگەیتو بڵێیت من کەسێکی سەرمایەدارم، ئامادەی ببیت بە هاوسەرم، خێزانەکەت دەگاتە ناو ئاهەنگەکە، ئەوە ئەو کۆتو بەندانەیە، کە ڕێگرە لە کردنەوەی بازاڕی نوێ.



# هێلکەی مریشك دەخۆیت، یان مراوی؟!

لە یەکێك لە کۆلێژەکانی بازرگانیدا، کە یەکێك لە وانە سەرەکییەکانیان بریتییە لە: بانگەشەی بازرگانی، مامۆستای بابەتەکە، باسی گرنگیی بانگەشەو ڕیکلام دەکات، بۆ برەودان بە بەرهەمەکانی هەر کۆمپانیاو کارگەیەكو بانگەشە وا دەکات، بەرهەمەکەت، ببینرێت، یا ببیسترێت، یان بخوێنرێتەوە. پاشان مامۆستاکە، پرسیارێك ئاڕاستەی خوێندکارەکانی دەکاتو دەڵێت:

بۆچی ئێمە، هێلکەی مریشك دەخۆین، کەچی هێلکەی مراوی ناخۆین، کە ڕێی تێ دەچێت، لە ڕووی خۆراکییەوە، لە هێلکەی مریشك باشتر بێت؟

خوێندکارەکان، هەریەکەیان وەڵامێکی دایەوە، بەڵام بەو وەڵامانەیان، دڵی مامۆستا بڕوایی نەدا، بۆیە پێی گوتن:

ئێمە بۆیە هێلکەی مریشك دەخۆین، چونکە کاتێك مریشك هێلکەیەك دەکات، دەست دەکات بە گارەگارو دنیا تێ دەگەیەنێت، کە هێلکەیەکی کردووە.

هەرچیی مراویشە، کاتێك هێلکەیەك دەکات، خۆی تێك ناداتو بە لەسەرخۆیی دەمێنێتەوەو بەرهەمەکەی بەشتێکی ئەو تۆ نازانێت، تا غاك غاکی بۆ بکاتو ئیدی کەس بە بەرهەمی مراوییەکە نازانێت.

هەر لەبەر ئەوەیە، گارەگاری مریشك، سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێتو ئەمەش وا دەکات، ڕوو لە خواردنی هێلکەی مریشك بکەن.

ئەمجا مامۆستا درێژەی بە قسەکانی داو گوتی:

لەم چیرۆکەوە، ئەوە فێر دەبین، کە ئەو بەرهەمهێنەرەی، یاخود ئەو کۆمپانیایەی بانگەشە بۆ بەرهەمەکانی دەکات، لای بەکارهێنەرانی متمانە پەیدا دەکاتو ڕوو لە کڕینی بەرهەمەکانی دەکەن، بگرە بانگەشەشی بۆ دەکەن. بەڵام ئەو بەرهەمهێنەرەی، یاخود ئەو کۆمپانیایەی بانگەشە بۆ بەرهەمەکانی ناکات، وەك مراوییەکە وایە، با بەرهەمەکانیشی باش بن، بەڵام بەکارهێنەران، نایناسن، لەبەرئەوە بێبازاڕی ڕوویان تێ دەکات.

هەروەها هەر کۆمپانیایەك، یان هەر دەزگاو ڕێکخراوێك، گەر لە بانگەوازو بانگەشە ڕاوەستا، ئەوا دەچێتە نێو ڕیزی نەبووانەوە. بۆیە کۆمپانیاو ڕێکخراوە گەورەکان، هەرچەندە ناسراویشن، بەبەردەوامیو هەر ڕۆژەو بە چەشنێك، بانگەشە بۆ خۆیان دەکەن، تا بوونی خۆیان بسەلمێننو لە بیری بەکارهێنەرانیان نەچنەوە.

# شێوازەکانی وەستان



زۆرکات تەنها لە ڕێگەی شێوازی وەستانی کەسێك، یان دانیشتنی، یاخود ڕۆیشتنییەوە، بارودۆخی دەروونی ئەو کەسەت بۆ دەردەکەێت، بۆیە زۆر گرنگە، بایەخی تەواو بەم لایەنانە بدرێت.

## گرنگی زانینی بارە جەستەییەکان:-

زۆر ئاساییە، پرسیارێك بە مێشکتدا بێت، بەوەی سوودی ئەم بابەتە چییەو لەڕێیەوە چیم دەستدەکەوێت؟ ئێمەش دەڵێین: ئەگەر ڕۆژێك، لە کۆمپانیایەك، یان هەرداەو دەزگایەکدا، چاوپێکەوتنێکت هەبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەکەویتە ژێر چاودێرییەکی وردی ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنەکەت لەگەڵدا دەکەن، لە ڕووی دانیشتنو شێوازی چوونەدەرەوەو هەڵسوکەوتەکانت لە کاتی قسەکردندا، یاخود لە کاتی وتوێژکردن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، یاخود لەو کاتەی دەکەویتە ناو کۆمەڵگایەکەوە، کە هیچ کارێکیان نییە، جگە لە ڕەخنە گرتن. بۆیە دەبێت لە هەوڵدا بیت، شێوازێك بدۆزیتەوە، کە بەشێکی زۆر لە چواردەورت ڕازی بکەیت.

## بەشی یەکەم: شێوازەکانی ڕۆیشتن:-

شێوازی دانانی قاچ، زانیارییەکی گشتی، سەبارەت بە باری دەروونی کەسەکە دەدات.

### ١- ڕۆیشتنی باوەڕبەخۆبوون:-

هەنگاوەکانی مامناوەندو یەکسانە، ڕوانینو ئاڕاستەی بەرەو پێشەوەیە، لەگەڵ کەمێك بەرزکردنەوەی سەریدا، بەڵام لە ئاستی سروشتی تێپەڕ نابێت، هەروەها سنگی ڕێك دەکاتو شانی تۆزێك بەرەو دواوە دەبات، بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ لاشەدا، قۆڵەکان بەرزدەکرێنەوەو بەرزییەکی مامناوەند، کە وادەکات هەست بکەیت، کەسەکە هاوسەنگیی جوڵەی ڕادەگرێت، بەوەی هەر هەنگاوێك یەکسان بێت بەوی تر، لە کۆندا وتراوە: ئەوەی لە هەنگاوەکانی دڵنیایە، وەك پاشا دەڕوات، وەك دەربڕی بڕوابەخۆبوون.

### ٢- ڕۆیشتنی تاوس:-

چەند شێوازێکی ڕۆیشتن هەیە، کە ئاماژە بە لوتبەرزیی دەکات، کە دیارترینیان بەرزکردنەوەی سەر لە سەروو ئاستی سروشتیی خۆیەوە، زۆربەی کات ئەمە لەگەڵ دەستخستنە ناو گیرفانەوە، ڕوودەدات، ڕەنگە بە ڕۆیشتنی لەسەر زەویدا، دەنگێك بە گوشار خستنە سەر زەویو ڕوانین لەسەرو شانەکانەوە لە کاتی ڕۆیشتندا، دروست بکات.. لەرزاندنی شانەکان، ئاماژەیە بۆ خۆبەگەورەزانین، هەروەها دوورخستنەوەی قۆڵەکان لە لاشەوە لە کاتی ڕۆیشتندا، ئاماژەیە بۆ لووتبەرزیو دەرخستنی هێز، وەك شێوەی خۆهەڵکێشانی تاوس بە پەڕەکانییەوە، کاتێك دەیەوێت بە گەورەتر لە قەبارەی خۆی، خۆی دەربخات.

### ٣- تەمبەڵیو خاوی:-

ئەو کەسەی بە خاوی دەڕوات، هەنگاوەکانی بە شێوەیەك خاو دەکاتەوە، کە دەڵێیت ناتوانێت قاچەکانی لە زەوی بەرز بکاتەوە، شانەکانی داچەقیونو سەری بە ڕاستو چەپدا دەبات، وەك بڵێیت: بارێکی قورسی هەڵگرتووەو دەیەوێت ڕزگاری بێت لێی، ئەم حاڵەتە دەرخەری بێکارییەکی زۆرە، ئاماژەیە بۆ هیلاکیو خەوتن دەکات، ڕەنگە دەرخەری نەخۆشیو ماندوبوون بێت، یان دەرخەری بێکارییەکی زۆرە، ئاماژە بۆ ماندوێتیو خەوتن دەکات، ڕەنگە دەرخەری نەخۆشیو هیلاکی بێت، کاتێك کەسەکە زیاد لە توانای خۆی هەوڵو کاری لاشەی، بەسەرخۆیدا دەدات.

### ٤- خەمۆکیو ناخۆشی:-

کەسی خەمۆك، یان دڵناخۆش بە خاوییەکی ئێجگار زۆر دەڕوات، سەیرکردنی بۆ خوارەوەیە، سەری بەرز ناکاتەوە، مەگەر بە دەگمەنو تەنها لە سنوورێکی تەسککراوەدا، هیچ باکی نییە، وەك بڵێی هیچ لە دنیا نابینێت، تەنها ئەو سنوورە دیاریکراوە نەبێت، کە تێیدا دەڕوات، دەستەکانی دەخاتە گیرفانیو خەریکە خەمو ناخۆشییەکەی دەگەیەنێتە هەموو ئەوانەی لە چواردەوری ئەون.

### ٥- دوودڵیو شەرم:-

ئەوەی شەرم لە بارودۆخێك دەکات، بە هەنگاوی ناهاوسەنگ دەڕوات؛ وەك بڵێی هەنگاوێك دەڕوات، هەنگاوێك دەوەستێت، بگرە وا خەیاڵ دەکات، قاچەکانی بەستراون بە زەوییەکەوە، هەوڵێکی زۆری دەوێت تا بەرزیان بکاتەوە، وەك بڵێی هێزێك هەیە دەیگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، ئەگەر وەرەقە، یاخود جانتا، یان کتێبی پێ بێت، لەبەردەمییەوە دای دەنێت، وەك پارێزەرێکی هاوشێوەی بووکێك، کە چەپکە گوڵێکی لە دەستدایە.

# لەبیرت بێتو لەبیری بکە!

زاهیر زانا



بیروهۆشو زەینی مرۆڤ، یەکێکە لە بەخششە هەرەگەورەکانی پەروەردگار بۆ مرۆڤ، لەسایەی ئەودایە؛ فێربووینو فێردەبینو ڕەفتاردەکەین، بە بوونی ئەوەوە، مرۆڤایەتی توانیویەتی زانیاریو داهێنراوەکانی دوێنێ، بگەیەنێتە ئەمڕۆو بۆ سبەینێش پەرەیان پێ بدات، ئەوەی هەیە، بە بوونی ئەوە، ئەوەی نییە، بە سوودوەرنەگرتنە لەو!

لەگەڵ ئەم هەموو سوودو کەڵکەیدا، هەندێجارو بۆ هەندێ شوێنو کات، لەبیرچوونو لەبیرکردنیش پێویستەو سوودی خۆی هەیە، ئێمە ئەگەر هەموو شتێکمان، هەموو کاتێك لەبیر بوایە، ئەوا ژیانمان زۆر ئاڵۆز دەبوو، بیهێنە بیری خۆت، هەمیشە کاتە سەختو ناخۆشەکانت بیر بوایە، یاخود بەردەوام، لەدەستدانی خۆشەویستانت لەبەرچاو بوایە! بێگومان لەبارودۆخێکی وەهادا، نەتدەتوانی بەردەوامی بە ژیانی ئاساییت بدەیت، یان لانی کەم، ژیان دەبووە پرۆسەیەکی دژوارو مرۆڤ ئەژنۆکانی هێزی لێ دەبڕاو پەرێشان دەبوو. هەر لەبەر ئەمەیە، کە دەڵێین: لەبیرکردنو لەبیرچوونەوە، دیسان نیعمەتێکی پەروەردگارنو بە مرۆڤو ژیانی بەخشیوە.

بۆیە گرنگە بزانین، یادەوەریمان چۆن بەکار دەهێنینو چی دەخەینە بیری خۆمانو چی لە بیری خۆمان دوور دەخەینەوەو بیر لە چی دەکەینەوە، لەبەرئەوەی دەگونجێت بیرو زەینی خۆمان بە شتانێکەوە سەرقاڵ بکەین، کە پێویست بێت بیری لێ نەکەینەوەو کاتو تواناو تەمەنی خۆمان بەفیڕۆ بدەین، (چۆن) بیرکردنەوەو بیر لە (چی) کردنەوە، لە چەند بیرکردنەوە گرنگترە، وەك دەڵێین: هزری بەرەبەیان، کردەوەی ڕۆژ دیاری دەکات.

هزرو بیرکردنەوەمان، وەك (پارەو دراو)وایە، دەکرێت شتی باشو سوودمەندی پێ بکڕین، هەروەك دەشێت شتی زیانبەخشو مەترسیداریشی پێ بکڕین! هەر لەبەرئەوەیە دەبێت بیرو بیرەوەریمان، پڕ لە شتە باشو چاکەکان بکەینو ناشیرینیو خراپەکان لەیاد بکەین.

گرنگیشە بزانین چی لەبیر دەکەینو بیر لەچی دەکەینەوە، بیر لەو شتە باشانە بکەینەوە، کە هەمانەو ئەو شتانەی کە نیمانە لە بیری بکەین، مەرج نییە ئەوانەی کەنیمانەو ئاوات بۆ بوونیان دەخوازین، بە هەبوونی ئاسودەتر ببین، دەگونجێت دەردەسەریمان زیاد بکەن! هەر لەبەرئەوە، نەبوونییەکانت لەبیر بکە.

ئیتر لە ئێستاوە، ئاگاداری بیرکردنو لە یادبوونەوەکانت بە... لەبیرت بێت کە ببەخشیتو لەبیری بکە، بە کێ دەبەخشیت، لەبیرت بێت؛ هەڵەکردن تایبەتمەندیی مرۆڤەو لێبوردن تایبەتمەندیی خودایی، بزانە ئەوەی تۆڵە دەستێنێت، ساتێك خۆشحاڵ دەبێتو ئەوەی دەبوورێت تەمەنێك، لەبیرت بێت هەمیشە هەوڵ بدەیتو تێبکۆشیتو ماندووبوون لەیاد بکە، خۆشیو شادی گەیشتن بە ئامانج ببینەو ئاستەنگو ناخۆشیو تەنگو چەڵەمەکانی ڕێگە، لەبیری خۆت ببەرەوە، چەرمەسەرییەکان لەسەر لم بنووسەو شادییەکانیش لەسەر بەرد هەڵبکۆڵە.

لەیادت بێت، کێ چاکەی لەگەڵدا کردوویتو لە بیری بکە چاکەت لەگەڵ کێدا کردووەو چاوەڕێی پاداشت مەکە، گوڵی باخەکان ببینەو دڕکی گوڵەکان بە ئاگادارییەوە، فەرامۆش بکە.. ئەوەی هەتە لە تەندروستیو بەخششەکانی ژیانت، بەگەورە ببینەو ئەوەی تا ئێستا پێی نەگەیشتویت پەرێشانت نەکات... خۆتت وەك خۆت قبوڵ بێتو لە نواندنو ڕووپامایی دووربە، لەبیری بکە ئەگەر نەگەیشتیتە دەریا، خەمباریی ناوێت، گرنگ ئەوەیە لە تینوێتیدا نەخنکاویت! لە یادت بێت متمانەکردن بە هەموو کەسو متمانەنەکردن بە هیچ کەسێك، هەردووکیان هەڵەن.

لەبیرت بێت کارکردن، بۆ چێژ بگۆڕیتو چێژیش بەکاری خۆت بزانیت، بیخەرە هزری خۆتەوە، دەستەکانت بجووڵێنیتو زمانت کۆنترۆڵ بکەیت، بیرت بێت هەلومەرجەکان دروستکەری تۆ نین، تۆ دروستکەری ئەوانیت، ئەو کاتەی پێت وایە: هەموو شتێك کۆتایی هاتووە، ئەوە خاڵی دەستپێکردنە.

لە یادی نەکەیت، لە تاریکیی شەودایە، دەتوانین ئەستێرەکان ببینین، بیخەرە زەینی خۆتەوە، شادومانی، وێستگەیەك نییە، پێی بگەیت، بەڵکو بەستەیەکە لەچرکەساتە دەگمەنەکانو چێژ بینینە لەو ڕێگایەی بەسەریدا دەڕۆیت، لە ڕێڕەوی ژیانتدا، لە فاریزە سوود وەربگرە، بەڵام هەوڵ بدە لە خاڵ بەدوور بیت، چونکە فاریزە ڕاوەستانو پشوویەکی کورتەو پاشان بەردەوام بوونە، بەڵام خاڵ کۆڵدانو تەواوبوون.

بیرت نەچێت مرۆڤ، وەك ڕووبار وایە، چەندە قوڵتربێت، هێندە هێمنترە، بزانە تۆ بەبلیمەتی لەدایك نەبوویت، دەبێت وردەوردە، دانایيو بلیمەتی بەدەست بهێنیت، بیخەرە بیری خۆتەوە، ژیان وەك پاسکیلسواری وایە، لە پایدەرلێدان بووەستیت، دەکەویت. بیرت بێت ئەوەی مەترسیدارە، ئاگر نییە، بەڵکو سووتانە بە ئاگر، دەبینیت کەشتی لە کەناردا زۆر هێمنو ئارامە، بەڵام دەبێت بچێتە قوڵاییەوە، لەبەرئەوەی ئەو بۆ کەنار دروست نەکراوە، بیرت نەچێت ئێمە گەورەترین وانەکان لە کاتە سەختەکاندا فێردەبین، لەبیرت نەچێت ڕقوقین کاریگەری لەسەر یەکەبەیەکەی ئەندامەکانی جەستەت هەیە، بۆیە ڕق لەیاد بکەو خۆشەویستی لەخۆتدا بچێنە، کە شەکر دەکاتە چای ژیانەوە، سوپاسکردن بکەرە زەینتەوەو لۆمەکردنو گلەیی لەبیرخۆت ببەرەوە، بۆ هەر شتێك بەئەندازەی گرنگیەکەی نیگەران بە، ئەوەش بزانە نیگەرانبوون، هیچ لەبارودۆخەکە ناگۆڕێت، لەیادت بێت چۆن ئاو شێوەی ئەو دەفرە دەگرێت، کە تێیدایە، ژیانی تۆش وێنەی بیروبۆچوونەکانی تۆ دەگرێت. ئەزیزم لە کاتێکدا، ئەم هەموو ڕەنگە جوانە، لە سروشتدا هەیە، نابێت تابلۆی ژیانت هەر لە ڕەنگی ڕەش دروست بکەیت، لەبیرت نەچێت ئەگەر چۆنێتیی مردن بەدەستی خۆمان نییە، ئەوا چۆن ژیان بەدەستی خۆمانە.. ئیتر لە ئێستاوە ئەوانەت لەیاد بێت کە دەتەوێت، ئەوانە لەیاد بکە، کە دەبێت لەیاد بکرێن، چیتر شوێنێکیان لە بیرو هزرو ژیانتدا پێ داگیر مەکە، ئەوە تۆیت ڕێگاکەت دۆزیوەتەوە، لەیادت بێتو بەردەوام بە لەسەری، هەنگاو هەڵبگرە بەرەو سەوزاییەکانی ژیانو بەرزاییەکانی خۆشبەختی!




ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# پاکوخاوێنیی دەمودان

گومانی تێدا نییە بۆنی دەم، دەرخەرێکی تایبەتیی پاکوخاوێنیو گرنگیدانی کەسەکەیە بەدەمودانی. هەندێجار خەڵکی، لە کەسێک کە بۆنی دەمی ناخۆشە، ڕادەکەن.. یان ڕووی لێوەردەگێڕن، یان هەندێجار دەبێت بە کێشە لە نێوان هاوسەراندا.

١. هۆکارەکانی بۆنی دەم چییە؟

أ. ئەوهۆکارانەی پەیوەندی بە هەندێک خووی خراپەوە هەیە:-

١. مانەوەی پاشماوەی خواردن لە دەمدا:- لەبەرئەمەیە پەیامبەر (دروودی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: (زۆر ئاو لەدەمو لووتتان وەربدەن، مەگەر بەڕۆژووبن).

٢. شەوخەوتن بەبێ شۆردنی دەمودان:- ئەمەش باشترین هۆکارە بۆ کۆبوونەوەی بەکتریاو کەڕوو لەدەمدا، بۆیە زۆر پێویستە سیواکو فڵچەو مەعجوون بەکاربێت.

٣. دەموشکی:- ئەمەش چارە دەکرێت، بە ئاووەردان لە دەمو لە ئەنجامدا میکرۆبەکان کەم دەبنەوە.

٤. خواردنی هەندێ خۆراکی بۆنناخۆش:- وەك سیرو پیاز، بەتایبەت ئەگەر بەبێ کوڵان بخورێت. هیچ جێی سەرسامی نییە، پەیامبەرمان(درودی خودای لێ بێت) ڕێگریی هاتنە ناو مزگەوتی لەو کەسە کرد بێت، کە سیرو پیازی خواردووە، بۆئەوەی ئازاری خەڵکی نەدات.

٥. جگەرە:- دەبێت بە هۆی بۆنێکی ناخۆش، ددان زەردبوون، هەوکردنی پووك، وازهێنانیش لە جگەرە، باشترین چارەسەرە.

٦. گردنە دەرەوەی میکرۆبو پاشەڕۆکانی کۆئەندامی هەناسە:- کە لەڕێی هەناسەدانەوە، دەردەکرێنە ناو دەمەوە.

٧. کاتی هەستان لەخەو:- ئەمەش بەهۆی دەمداخستنو کەم دەردانی لیکەوەیە لە کاتی نووستندا، لەبەرئەمە بووە، سەروەرمان (سڵاوی خودای لێ بێت)، کاتێك لەخەو هەڵدەستا، یەکەم شت کە دەیکرد، سیواککردن بوو.

ب. ئەونەخۆشیانەی بۆنی دەم دروست دەکەن:-

یەکەم: ناتەواوییەکانی پووكو ددان:-

١. بوونی کەلێن لە نێوان کاکیلەکاندا: ئەم کەلێنانە، خواردن لە نێوانیاندا دەمێنێتەوەو دواتر بەئاسانی دەرنایەت، چارەسەر ئەوەیە: زوو زوو دەموددانمان بشۆینو پێش کلۆربوون، ئاو لەدەممان وەربدەین، ئەگەر دانەکەش کلۆربوو، یان چاڵ بوو، ئەوا پێویستە سەردانی پزیشکی ددان بکەین.

٢. هەوکردنی پووك:- مانەوەی پاشماوەو پیسی بەپووکەوەو پاکنەکردنەوەی دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی میکرۆبەکانو لەئەنجامدا بۆن دروست دەکات.

٣. پاکنەکردنەوەی نێوان ددانەکان:- ئەمەش تەنها بەدەزووی ددان پاککەرەوە چارەسەر دەکرێت.

دووەم:- ناتەواویی لە ئەندامەکانی تری لەشدا:-

١. سستی جگەر.

٢. بۆنی نەخۆشی شەکرە:- ئەگەر ئاستی شەکرەکەی کۆنترۆڵ نەکات، ئەوا لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی شەکر لەخوێندا، ئەسیتۆن دروست دەبێت، کە بۆنی وەك سێوی بەسەرچوو وایە، بۆنێکی زۆر ناخۆشو بێزارکەر، لە زاری نەخۆشەکەدا، دروست دەکات.

٣. هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە:- وەك ڕێڕەوی هەواو سییەکان.

٤. شکستی گورچیلە:- بەهۆی کۆبوونەوەی میزی خوێناویی.

٢. چارەسەری بۆنی دەم:-

* چارەسەرکردنو بنەبڕکردنی ئەوهۆکارانەی بۆنەکە دروست دەکەن، لەلایەن پزیشکەوە.

* بەکارهێنانی غەرغەرەی پاککەرەوەی دەم(mouth wash) بەتایبەت ئەوانەیان کەپاکژکەرەوەنو میکرۆبەکان لەناو دەبەن.

* بەکارهێنانی سیواکو فڵچەو مەعجون.

* بنێشتی بۆنخۆش.



# چۆن خۆشبەختیو ئارامی ڕاستەقینە بەدەست دەهێنیت؟

لە ئینگلیزییەوە: کاروان ئەحمەد

ئایا هیچ کات کەسێك پێی وتوویت کە سەروەتو سامانو پێگەو ناوبانگ بریتین: لە کلیلی خۆشبەختی؟ ئایا ئەمانە ئەو خۆشبەختییەی کە هەموو کەس بە دوایدا وێڵن، فەراهەم دێنن؟ جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە نزیکت دەکاتەوە لە خۆشبەختی ڕاستەقینەو بەردەوامبوونی:-

١- کەسێکی بەخشندە بە:-

هاوکاریکردنی کەسانی دی بە میهرەبانانەو خۆبەخشانە بەخشندەییت دەسەلمێنێت. هونەری بەخشین دڵەکان خۆشو ئارام دەکات، ئاگاداربە ئارامیو خۆویستی پێکەوە هەڵناکەن.

٢- خۆتت خۆشبووێت:-

زۆر لۆمەی خۆت مەکەو خۆت بەکەم مەزانە، چونکە هیچ کەسێك بێ کەموو کورتی نییە. خۆتو ژیانت بە هەموو شێوەکانییەوە خۆشبووێت. بە دڵێکی فراوانو ڕەفتارێکی ئەرێنیانەوە ئەو پێشهاتانە پەسەند بکە کە ڕووبەڕووت دەبنەوە.

٣- کەسێکی ڕووخۆشبە:-

ببە بە کەسێکی ڕووخۆشو یارمەتیدەر. ئەمەش واتای ئەوە نییە هەرکەسێکت بینی بیبەیتەماڵەوە، بەڵام دەتوانیت هەمیشە هەڵسوکەوتی جوان بنوێنیت لەبەردەم کەسانی دیدا. گەر تۆ بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵ کەسانی تردا بجوڵێیتەوە، ئەوا تۆش لە بەرامبەردا ئەو ڕووە خۆشەت پێدەبەخشرێتەوە.

٤- هەرگیز دەمەقاڵێ مەکە:-

بۆ شتی پووچو بێ مانا هەرگیز گفتوگۆو دەمەقاڵێ مەکە. هەموو شتێك شایەنی ئەوە نییە کە تۆ لە پێناویدا بجەنگیت، ناشتوانیت هەموو کەسێك بگۆڕیت. کەواتە گەر خۆشبەختیو ئارامیت دەوێت، ئەوا خۆت بە دوور بگرە لەم جۆرە گفتوگۆیانە.

٥- خۆت سەرقاڵ بکە:-

خۆت بە کارێکی باشو بەرهەمدارەوە سەرقاڵ بکەو لە هەمان کاتیشدا ئارامیو حەوانەوە بە خۆت ببەخشە. گومانی تێدا نییە کە زۆرجار خۆسەرقاڵکردن لە بیرکردنەوەی نەرێنی دەتپارێزێت.

٦- خۆتبە، نەك کەسێکی تر:-

هەوڵبدە خۆت لەگەڵ کەسانی دی بەراورد نەکەیت، هەموو کەسێك قورساییو نرخو بێ وێنەیی خۆی هەیە لەم جیهانەدا. ڕاستییەکان بە دڵێکی فراوانەوە وەربگرە، چونکە دڵنیابە کە تۆ خاوەنی دڵێکی باشیت.

٧- توانای بەخشینو لەبیرکردنت هەبێت:-

بزانە کە ئەو ڕقو تووڕەییەی لە ناختدایە کاریگەری خراپیان دەبێت بۆ سەر جەستەت، گەر توانای بەخشینت هەبێت ئەوا توانای لەبیرکردنیشت دەبێت. لێبووردەیی هەرچەندە کارێکی سەختیش بێت، بەڵام ئارامییەکی تەواوت پێدەبەخشێت. کەواتە لێبووردەبە گەر لە پێناوی خۆشتدا بووبێت.

٨- کەسێکی ڕاستگۆبە:-

لەگەڵ خۆتدا کەسێکی ڕاستگۆبەو بزانە کە چیت دەوێتو چاوەڕێی چی لە خۆتو کەسانی دیش دەکەیت. ئەمە کارێکی ئاسان نییە لە سەرەتاوە، بەڵام هەر کە زانیت بە ڕاستی چیت دەوێت، ئەوا بەدیهێنانی ئامانجەکانت ئاسان دەبێت.

٩- هێمنو لەسەرخۆبە:-

هێمنیو لەسەرخۆیی لە بڕیاردانی بەپەلەو بێ بیرکردنەوە دەتپارێزێت. هەر وەك ئاشکرایە کە مرۆڤ قسەیەکی کرد گەڕانەوەی نییە، جا لەبەر ئەوە ئاگاداربە بیر لە قسە بکەرەوە پێش وتنی.

١٠- خزمەتی کەسانی دی بکە:-

خۆشبەختی ڕاستەقینە کاتێك بەدەستدێت کە تۆ واز لە نیگەرانییەکانی خۆت دەهێنیتو خزمەتی کەسانی دی دەکەیت. هاوکاریکردنی هاوڕێو ئەزیزانت خۆشیو واتا دەبەخشێت بە ژیانت. لە لایەکی ترەوە، خۆویستی تەنها خۆشییەکی کاتیت پێدەبەخشێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ بە تەواوی دەستبەرداری خۆتبیت، چونکە جەستەشت پێویستی بە گرنگی پێدان هەیە، بەڵام گەر تەنها گرنگی بە خۆت بدەیت، ئەوا ناگەیتە خۆشبەختیو ئارامی ڕاستەقینە.

سەرچاوە: www.wikihow.com

شناویا محەمەد



# خۆت بگۆڕە.. ژیانت دەگۆڕێت!

یەکێک لەو نوسەرانەی کە زۆر سەرسامی نووسینو بیرۆکەکانیم، (د. ئیبراهیم فەقێ)یە، کە سەرجەمی نووسینەکانی بریتییە لە: ڕێنمایی دەروونو باشکردنو بەرەوپێشبردنی توانا ناوەکییە مرۆییەکان، لە یەکێک لە کتێبەکانیدا، کۆمەڵە ڕستەیەکم بەرچاو کەوت، کە نازانم ئەوە وتەی خۆیەتی، یان هی کەسێکی دیکەیە، بەڵام بەڕاستی وێنەی خۆمم تێدا بینیو بەتەواوی گوزارشت لە بارودۆخی ئەو کەسانە دەکات، کە دەیانەوێت ئامانجەکانیان بەدیبهێنن، بەڵام بەهۆی گرتنەبەری ڕێگای هەڵەوە، زۆر دوور دەبن لە بەدیهێنانی خەونو ئامانجەکانیان، ئێستا من دەمەوێت، دێڕ بە دێڕ بۆ هەمووانی بنووسمەوە، بۆ ئەوەی ببێت بە هەنگاونانێك بۆ تێکشکانی هەموو ئەو ڕێگرانەی کە دێنە سەر ڕێگاکانیان، درووست وەکو ئەو کەسەی ویستی هەموو جیهان بگۆڕێت، سەرەنجام نەیتوانی خۆشی بگۆڕێت!

(خۆت بگۆڕە.. ژیانت دەگۆڕێت) ئەوە نهێنیەکەیە، ئەوە کۆدەکەیە! ئەوە ئەو کلیلەیە، کە دەمێکە بەدوایدا وێڵین بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایانەی، کە ئاواتیان پێ دەخوازین، گۆڕینی خۆت لەپێش گۆڕینی هەموو شتێکی دیکەوەیە؛ یەکەم هەنگاوە بۆ بەرچاوڕوونیی ئەو شتانەی کە مەبەستەو دەتەوێت دەستەبەری بکەیت بۆ خۆتو بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەتەوێت، ئەگەر ئێمە توانای ئەوەمان نەبێت، کە خۆمان بگۆڕین، چۆن توانای گۆڕینی خەڵکی دیکەمان دەبێت؟! یەکەمین کێشە، کە لە کاتی ئەنجامدانی ئەو پلانانەدا، کە نەخشەکێشراوی خۆمانن، بۆ ئێمە درووست دەبێت، بریتییە لە:- (خۆمان)!

ئەم جارە.. من چیرۆکی خۆم دەنووسمەوە، چیرۆکێك کە بریتی نییە لە سەرکەوتن، یان بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە کەسی دیکە بەدەستی نەهێناوە، بەڵکو بریتییە لە:- دانپێدانان بەوەی کە بەڵێ.. هۆکاری شکستی من، بریتی بوو لە (خۆم).. من بە نەزانینی هۆکاری شکستەکەم، دووبارەو چەندبارە، هەمان شتم دووبارە دەکردەوەو بەهەمان ڕێگەدا دەڕۆیشتم، ئەگەر هەموو جارێکیش هەمان کار دووبارە بکەیتەوە، هەمان ئەنجامیش بەدەست دەهێنیت!

من.. لە تەمەنی خوێندنمدا، هەر لە قۆناغی بنەڕەتییەوە، هەتا قۆناغی دوانزە، یەکێك بووم لە زیرەکترین خوێندکارەکانی خوێندنگەکەم، کە هەموو کات، بۆ مامۆستاو خێزانەکەم، جێگەی شانازی بووم، ئەوان هیوایەکی زۆریان بە من هەبوو، پڕ لە چالاکیو وزە بووم، تەنانەت سەرەڕای ئەنجامدانی کارەکانی خوێندنگا، بەشداریی چالاکی جۆراوجۆریشم دەکردو لەوەشدا بەهەمان شێوە سەرکەوتوو بووم، زنجیرەی خوێندنی من، بەم شێوەیە ڕۆیشت، هەتا قۆناغی دوانزە.. لێرەوە کێشەو چارەسەری هەڵە، دەستی پێکرد! من لە قۆناغی دوانزەدا، ڕۆژ بە ڕۆژ چالاکییەکانم، بەرەو لاوازبوون دەڕۆیشتو وزەی تەواوم بۆ سەعیکردن نەبوو، هەموو کات بە شێوەیەکی جیاواز، سەیری بابەتەکانم کردووەو بەخۆمم دەگوت: چۆن ئەو هەموو وانەیە تەواو دەبێت؟! ئەم هەموو زانیارییە، چۆن دەتوانرێت بە تەواوی لە مێشکدا بچەسپێتو لەوەش خراپتر، تێیدا بمێنێتەوە؟!! من بەردەوام هەوڵێکی زیاد لە پێویستم

دەداو بەشێوەیەکی زۆر سەیر، خۆم ماندوو دەکرد، کە زیاد لە توانای خۆم بوو، بیانووی جۆراوجۆرم دەهێنایەوە، کاتێکیش کە چارەسەریان بۆ دەدۆزیمەوە، ئەنجامەکەم هەر هەمان شت بوو!! ساڵی یەکەم، گوتم: پۆلی دوانزە پێویستی بە دارشتنی پلانێکی تۆکمەو بەهێز هەیە، بۆئەوەی سەرکەوتوو بیت، بیرمە ڕۆژێکیان باوکی خۆشەویستم، لەگەڵمدا دانیشتو خشتەیەکی زۆر بەهێزو ڕێکوپێکی بۆ دروستکردمو گوتی: لەسەر ئەم خشتەیە سەعی بکەو پشت بەخودا ببەستەو بەهیوای سەرکەوتن.. سوددی نەبوو! گوتم: خوێندنگەکەم باش نییەو پێویستە بڕۆم بۆ خوێندنگەیەکی دیکە. من لێرە، ناتوانم ئەو نمرەیە بهێنم، کە خۆم دەمەوێت، ناردیانم بۆ خوێندنگەیەکی دیکە، بەڵام هەر بەهەمان شێوە بوو! گوتم: وانەکان زۆرنو لە خوێندنگە کاتی تەواومان نییە، بۆ ئەوەی بەجوانی تێیان بگەین، پێویستم بە مامۆستای تایبەت هەیە، لە هەر سێ وانە زانستییەکەدا، مامۆستای تایبەتییان بۆ گرتمو ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك لای ئەوان، وانەم دەخوێند، ئەوەش هەر نەیتوانی من سەرکەوتوو بکات!! هەموو داواکارییەکانم جێبەجێ کرا، تەنها لە پێناوی ئەوەدا، کە سەرکەوتوو بمو نمرەیەکی باش بەدەست بهێنم، بەڵام من، نەمتوانی سوود لە هیچ کامیان وەربگرمو ٣ ساڵی تەمەنم لە پۆلی دوانزەدا بەفیرۆ دا، هەموو شتەکانیان بۆ گۆڕیم، بەڵام لەبەرئەوەی نەمتوانی خۆم بگۆڕمو ئەو وێنەیەی لە مێشکمدا چەسپاندبووم بەرامبەر بە وانەیەکی دیاریکراو، وێنەیەکی تاریکو ئاڵۆزبوو، نەمتوانی ئامانجەکەم بپێکم! کێشە سەرەکییەکە بریتی بوو لە: خۆم، من باوەڕێکی هەڵەم لە مێشکمدا چەسپاندبوو، کە نمرەی کەمم ناوێتو ئەگەر نەتوانم نمرەی کۆلێژی پزیشکی بەدەستبهێنم، ئەوا ئامادەنیم ئەم قۆناغە بەجێ بهێڵم! ئەو وێنەیەی لای من چەسپابوو، توانی شکست بە هەموو پلانو هەوڵەکانم بهێنێت. دواتر، پاش ئەم هەموو هەوڵو بینینی شکستە، لە کۆتاییدا توانیم هۆکاری ڕاستەقینە بدۆزمەوەو توانیم تێڕوانینی خۆم بگۆڕمو لە ئەنجامیشدا توانیم ئەنجامێکی جیاواز، بەدەست بهێنم.

ڕاستە ئەوە بۆ من، قۆناغێکی زۆر ناخۆشبوو، چونکە وردە وردە هەستم دەکرد، بێهیوایی خەریکە ژیانم دادەپۆشێتو هێندەی نەمابوو، لە خوێندکارێکی زیرەکو بەهیواوە، ببم بە کەسێکی نامۆ!! لەگەڵ ئەوەشدا، سێ ساڵی تەمەنم لەیەك قۆناغدا بەسەربرد، کە پێویست نەبوو وا بێت، سەرەکیترین کێشەش بریتی بوو لە: خۆم. من ئامانجێکی گەورەم دەویست، لە هەمان کاتیشدا وێنەیەکی ئاڵۆزم، لە مێشکی خۆمدا چەسپاندبوو، کە ئەم دووانەش، بەهیچ شێوەیەك یەك ناگرنەوە، بەڵام لە کۆتاییدا فێربووم، کە تاکە کێشەیەك بۆ هەر کارێك دێتە پێشەوە، بریتییە لە: تێڕوانینی هەڵەی خۆمان، بۆ ئەو کارە.

خاڵی مەبەستو گرنگ لێرەدا، بریتییە لە: (دۆزینەوەی خود، دۆزینەوەی ئامانج، چۆنییەتی هەڵبژاردنی ڕێگا ڕاستەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج، دۆزینەوەی هەر کێشەیەك کە هەبێتو دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو، متمانەکردن بە بەدیهێنەری خۆتو دڵنیابوون لە میهرەبانیو توانای بێ سنووری ئەو)، ئەمانە پێکهێنەری ژیانێکن، کە تێیدا، خاوەنی هەموو ئەو شتانە دەبیت، کە ڕۆژێك ئاواتت پێخواستوون.

# وەڵامی بەجێ

سەلام کانەبی

* نووسەرێك بە بەرنادشۆی نووسەری بەناوبانگی گوت: من باشترم لە تۆ، تۆ لەپێناوی پارەدا دەنووسیت، بەڵام من لە پێناوی شەرەفدا دەنوسم.

بەرنادشۆ لە وەڵامدا گوتی: ڕاستدەکەیت، هەریەك لە ئێمە بۆ ئەو شتە دەنووسین کە نیمانە.

* کاتێك پیاوێکی قسەڕەق، بە شاعیری بەناوبانگی عەرەب بەشار بن بردی نابینای وت: هیچ نابینایەك نییە، خودا بە شتێکی تر قەرەبووی کردووەتەوە، تۆی بەچی قەرەبوو کردووەتەوە؟

بشار وەڵامی دایەوە: منی بەوە قەرەبوو کردووەتەوە کە نموونەی وەك تۆ نەبینم!

* نابینایەك هاوسەرگیری لەگەڵ کچێك کرد!

کچەکە وتی: ئەگەر جوانیو قەشەنگی منت دەبینی، سەرسام دەبوویت.

نابیناکە وتی: ئەگەر بەوشێوەیە بوویتایە کە دەڵێیت، چاوساغان بۆ منیان جێ نەدەهێشتیت.

* پیاوێك بە المتنبی شاعیری وت: لە دوورەوە بینیمیت وامزانی ژنیت!

متنبی وتی: منیش لە دوورەوە تۆم بینی، وامزانی پیاویت!

* ئافرەتێکی زۆر ناشیرین بە پیاوێکی وت: ئەگەر مێردی من بویتایە، ژەهرم دەکردە ناو قاوەکەتەوە.

پیاوەکە وتی: ئەگەر خێزانی من بویتایە، یەك دەقە نەدەوەستام، یەکسەر دەمخواردەوە.

* پرسیارکرا لە مەلیك فەیسەڵ: دەبینین مووەکانی ڕیشت ڕەشنو مووەکانی سەریشت سپین؟

وەڵامی دایەوە: مووەکانی سەرم بیست ساڵ پێش مووەکانی ڕیشم هاتوون.

*دەشتەکییەکی نەوسنو زۆرخۆر لای فەرمانڕەوایەك بوو...

فەرمانڕەواکە وتی: چییە وا ئەو بەرخە دەخۆیت دەڵێی دایکی قۆچی لێداویت؟

وەڵامی دایەوە: ئەی تۆ چیتە بەزەیت پێدا دێتەوە، دەڵێی دایکی شیری پێداویت؟

* پیاوێك بە بەرنادشۆی وت: ئایا چێشتلێنەر سودی زیاتر نییە بۆ گەل، لە شاعیرو نوسەر؟

بەرنادشۆ وتی: سەگەکان باوەڕیان وایە.

# هاوڕێیەکی باشبن!

ئێمە لە سەردەمێکداین، شتە خۆڕاییەکان لە ونبووندان، کۆمەڵە شتێکی دیکە لە لوتکەدان، کە دەکەونە بەر کێبڕکێ لەسەرکردنو ئاڵوگۆڕکردن، ئەم بارودۆخەش وادەکات؛ خەڵکی هەست بە ترسو بێزاری بکەن، کە ناچاریان دەکات، پەنا ببەنە بەر پەیوەندییەك بەو وێنە مرۆیی‌و خێرخوازییە، ئەمەش لە پەیوەندییەکانی وەك برایەتی‌و هاوڕێیەتیی ڕاستەقینەدا دەبیننەوە. ژیان لەمڕۆدا، هاوشێوەی بیابانێکی گڕگرتووە، هاوڕێی بەوەفاش، تێیدا سرووەی شنەباو سایەی سێبەرو دڵۆپە شەونمی فێنکەو سوکناییە بۆ دەروون، تروسکاییە بۆ بینایی، ئاوازێکی شیرینە بۆ بیستن. کەواتە: تایبەتمەندییەکانی هاوڕێیەکی باش چین؟ ئەمە ئەوەیە کە لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا ڕوونی دەکەینەوە:-

* یەکەم هەنگاو لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا، بریتییە لە:- سووربوون لەسەرئەوەی کە باشبێت، مرۆڤ بە هاوڕێیەتیکردنی سوودمەندبێتو لە خووڕەوشتی فێربێت، لە تەنگانەدا لای ئەو داڵدە بدرێت، پێشەوامان «درودی خودای لێ بێت» دەفەرموێت: «نموونەی هاوەڵ، وەك گوڵاوفرۆش، یان ئاسنگەر وایە؛ جا گوڵاوفرۆش گوڵاوت پێ دەدات، یان گوڵاوت بەر دەکەوێت، یان بۆنێکی خۆشت بەسەردا دێت، بەڵام ئاسنگەر، یا جلەکانت دەسوتێنێت، یان بۆنێکی ناخۆشت بەسەردا دێنێت»، ئاگاداربن، دیسان ئاگاداربن لە هاوڕێی خراپ، ئەو کەسانەی هیچ ئامانجو پەیامێکیان نییە لە ژیاندا، چونکە کاریگەریی هاوڕێیی خراپ، زۆر لەوە ترسناکترە کە پێشبینیتان کردووە، وا لە هاوڕێ مەڕوانن، کە سەرچاوەیەك بێت بۆ سوودبینینو دەسکەوتێکی دنیایی‌و بەس، بەڵکو وا لێی بڕوانن، کە سەرچاوەی لوتفو هیدایەتو بەخششە، لەلایەن خودای باڵادەستەوە، چ شتێك لەوە مەزنتر هەیە، کە خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بفەرموێت: وەك لەم فەرموودە قودسییەدا هاتووە: «کوان ئەوانەی لە دنیادا لەبەر من یەکدییان خۆشدەویست؟ ئەوا من ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری عەرشی خۆمەوە».

* ئەو کەسانەی لە هەوڵی چاکسازیدانو دەیانەوێت هاوڕێیەك بن لە ئاستێکی باڵادا زۆر کەمن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، بۆیە پێشەوا عومەر «ڕەزای خودای لێ بێت» دەفەرموێت: «ئەگەر کەسێك لە ئێوە، هاوەڵێکی دڵسۆزو خۆشەویستی دەستکەوت، ئەوا بادەستی پێوە بگرێت، چونکە دەستکەوتنی هاوەڵانێك لەم جۆرە، زۆر دەگمەنە».

سکاڵای خەڵکیش لە کەمیی هاوڕێ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆرێك لە هاوڕێی بەوەفاو ڕاستگۆیان دەوێت، ئەمەش زۆر قورسە. بگرە لە زۆربەی کاتدا، کەسەکە هاوڕێیەکی باشی دەست ناکەوێت، چونکە خۆی لە بنەڕەتدا، کەسێکی باش نییە. لە زۆربەی کاتدا بەجێهێنانی هاوڕێیەتییەکی ڕاستەقینە، زۆر گران دەبێت لای هەندێك کەس، بۆیە پەنادەبەنە بەر کەمکردنەوەی ژمارەی هاوڕێکانیان.

* بەشێوەیەك بن هاوڕێکانتان هەست بکەن، کە دەتوانن لە تەنگانەو کاتە سەختەکاندا، پشتتان پێ ببەستن. دەتوانن بە بێ هیچ ڕووگیری‌و تەریقبوونەوەیەك، داوای یارمەتیتان لێ بکەن، بەبێئەوەی ترسی منەتکردنیان هەبێت، دڵنیایان بکەنەوە، ئەوەی لای ئەوان نهێنییە، وەك ئەمانەتێکی پارێزراو، لاتان دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر پەیوەندیشتان، بەرەو خراپی ڕۆیشت.

* لە کەوتنی هاوڕێکان، چاوپۆشی بکەن.. هەڵەکان داپۆشن، تۆمەتبارکردن کەم بکەرەوە.

* مافی هاوڕێیەتیی بەسەرمانەوە، ئەوەیە کە بە نهێنیی ئامۆژگاری بکەین، لەبەرچاوی خەڵکیدا پێیدا هەڵبدەین، وتەکانی لە بەرزترین ئاستدا دابنێین، پاساوهێنانەوەی قبوڵ بکەین.

* هاوڕێیەکی باشبن، هاوڕێیەتیتان لەسەر بنەمای سوودو کەڵکی ماددی دامەمەزرێنن.

* هاوڕێیەتی، وەك ڕووەکێکی ناسك وایە، پێویستی بە ئاودانو بایەخدانو پارێزگاریکردنە، ئەگەرنا، لەدەستی دەدەین.

* لە کۆتاییدا کوڕو کچە ئازیزەکانم پێتان دەڵێم: ئەمانە گران نین‌و داواکاری قورس نین، بە هەمان شێوەی ئەوەی کە دەیبەخشن، ئەوە بەدەست دەهێننەوە، خۆشبەخت دەبێت بەدەربڕینە جوانەکانیان، وەك چۆن ئەوانیش بە دەربڕینەکانت، خۆشبەخت دەبن.

ن: د. عبدالکریم بکار/ و: ئاسیا صەلاح



# چۆن ئاڕاستەی دژوارییەکان، بگۆڕین بۆ سەرکەوتن؟

و: هێشو والی

بە درێژایی کات، زۆربەمان تووشی دژواری بووین، لەوانەیە ئەمە، کاری لە پیشەکەمان کردبێت، هەروەها وەکو پەروەردەیەکیش بووبێت بۆ سەرکەوتنمان، ئێستا باشترین ڕێگە، بۆ سەرکەوتن چییە؟! ئەمانە هەنگاوی سەرکەوتووترین کەسەکانی جیهانن.

**هەنگاوەکان:-**

**- وابزانە هەموو ڕۆژێك لە ژیانتدا، ڕۆژێکی نوێیە:-** پێویستە ئەوە زۆر باش بزانیت، کە هیچ کەسێك ناتوانێت بڕیارت لەسەر بدات، خودا نەبێت، ئینجا دەست پێبکە، هەموو ڕۆژێك لە خۆت ڕازیبە، هەروەها لە هەموو کەسەکانی چواردەوریشت، ئەوەش بزانە، لەو ڕۆژەوە تۆ، دەست بەژیانێکی تازە دەکەیت.

١- سەرەتا بۆ ماوەی پێنج خولەك، بیر لە جوانترین ئەو شتانە بکەرەوە، کە لە ژیانتداو دەتەوێت بەردەوام بن.

٢- بەیانیان نانێکی باش بخۆو هەندێك گوشراوی میوەی تازە بخۆرەوە، پلانێك تەنها بۆ ئەمڕۆ دابنێ... نە بۆ سبەینێو نە هەفتەیەك دواتر... تەنها بۆ ئەمڕۆ.

٣- بەخەندەوە، دەست بە بەرنامەکەت بکەو گومانی باش بەخۆت ببە، چونکە تۆ باشتریت لە زۆرێك خەڵکی لە جیهاندا.

٤- ئاماژەی پێبدە لە ڕۆژانە بەرنامەکەتدا.. هەر ئێستا هەموو شتێك لەبیر بکە، بە ماوەی یەك خولەك ڕابردووتو داهاتووت لەیاد بکە، یان هەرشتێك کە وات لێدەکات بیر بکەیتەوە. وابزانە لەو ساتەوە، کات تەنها بۆ تۆ وەستاوە. بزانە لە ژیانی خۆتدا، تۆ پادشایت، وەکو پادشایەك هەڵسوکەوت بکە.

٥- هەموو چرکەساتێك لە دوای تەواوبوونی بەرنامەکەت، لە خۆت ڕازی بە، وەکو ئەوەی کۆتا چرکەساتت بێت: سڵاو لەو کەسانە بکە، کە دەیانناسیتو ئەوانەش کە نایانناسیت.

٦- کەمێك ڕاهێنانی وەرزشی ئاسان ئەنجام بدەو ئێوارە خوانێکی باش بخۆ.. کە چوویتە سەر جێی نووستنەکەت، بیر لەوە مەکەرەوە دەبوو ئەمڕۆ چی ببێت... پێویستە زۆر ئەرێنی بیر بکەیتەوەو گومانی باش بەخۆت ببەیت، لەبەر ئەنجامدانی کارێکی باشو تەواوکردنی بەرنامەی ڕۆژەکەت، پیرۆزبایی لە خۆت بکە.

٧- چاوەڕێ مەبە کەسانی دیکە، پیرۆزباییت لێبکەن، یان هانت بدەن، یان تەنانەت سوپاسیشت بکەن، لەبەرئەوەی کارێکت بۆ ئەنجامداون، بەبیرت بێتەوە تۆ لە ژیاندا، ئەوەی دەتەوێت هەمووی تەواوکردنی خشتەی ڕۆژانەکەتو دڵخۆشبوونتە لە کۆتایی ڕۆژەکەدا... ئەمە هەموو شتێکە.

٨- پێویستە بڕوات وابێت هەموو شتێك بەدەستدەهێنیت کە دەتەوێتو هەموو خەونەکانت دەبێت بە ڕاستیو بەخۆت دڵخۆش بە. تۆ بەهێزیت، چونکە هەموو کەسێك ناتوانێت، هەر بە بەهێزی بمێنێتەوەو بەردەوامبێت لەسەر خشتەی کارو تەواوکردنی ڕۆژەکانی.

٩- ڕێژەی سەدی بۆ ئەو کارانەت دابنێ کە ئەنجامت داوە.

١٠- کارکردن بە بچووکی، گەورەیی، بڵندی، یان نزمی نییە.. هەر کارێك کە ئەنجامتدا، بە کەم، یان بچووکی مەزانە، چونکە لە کۆتاییدا، کارێکت ئەنجام داوەو هەموو کارێکیش بەهای خۆی هەیە.

**ڕوونکردنەوە:-**

* نابێت گوێ بەوە بدەیت، خەڵکی چی دەڵێن، یان چۆن بیرت لێدەکەنەوە، پەرۆش مەبەو بۆی دامەچۆ، چونکە ئەو کەسانەی کە سەرکەوتووبوون، لە تۆ باشتر نەبوون.

* کە کارەکانت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، یاخود کارێکی ڕەسمی جێبەجێ دەکەیت، لەوانەیە سەرکەوتوو نەبیت، بەڵام هەوڵ بدە سەرنەکەوتنەکەت بچووك بکەیتەوە، بە گرتنەبەری ڕێگەیەکی دیکە، یان کپی بکەرەوە.

* بەبیرت بێتەوە، ئەگەر پشت بە پلانەکانی پێشووت ببەستیت، ئەوا نابیت بە یەکێك لە سەرکەوتووترین کەسە جیهانییەکان لە هیچ بوارێکی ژیاندا، پلانی تازە تکایە.

* ڕووداوو بارودۆخەکان بەدەست ئێمە نین.

* لە هیچ ڕۆژێکدا چاوپۆشی لە پلانەکانت مەکە.

* پلانە ڕۆژانەکانت ئەنجام بدەو خاڵە گرنگەکان تەواو بکە.

* کۆنترۆڵی خۆت لەدەست مەدە.

ئاگاداربە..

* تەنها پلان بۆ هەموو ڕۆژێکت دابنێ، بە بێگوێدانە ئەوەی سەرکەتوو دەبیت، یان نا!

* سەرقاڵ مەبە بە سەرکەوتن، یان شکستەوە، لەبەرئەوەی تۆ هەموو ڕۆژێك ئەرکێکت هەیە "خشتەی کارەکەت، یا پلانەکەت"!

* ئەگەر سەرکەوتیت، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دڵخۆش مەبە!

# باڵۆڵو خەلیفە هارون..
# سەردانی مامۆستای
# ئەمینو مەئموون دەکەن!

لە چیرۆکی ئەمجارەماندا سـەبارەت بە ژیاننامەی حەکیم، باس لە سـەردانێکی حەکیمو خەلیفە هاروون دەکەین، بۆ قوتابخانەی (ئەمینو مەئموون)، کوڕەکانی خەلیفە هارون.. ڕۆژێك حەکیم بۆ دیداری خەلیفە بەڕێکەوت بۆ کۆشـك، لە ڕێگەدا چاوی بە خەلیفە کەوت، خەلیفە دوای سلاوکردن پرسی: حەکیم بە نیازی بۆ کوێ بڕۆیت؟

حەکیـم لـە وەڵامدا وتی: بـە نیازبووم بێم بۆ کۆشـك بۆ دیداری بەڕێزتان.. خەلیفە وتی: من بە نیازم سـەردانی قوتابخانەی منداڵەکانم بکەم بە مەبەسـتی هەواڵ پرسـینیان، دەتوانیـت هاوڕێیەتیم بکەیتو لەگەڵمدا بێیت؟

حەکیم ڕەزامەندی دەربڕیو لەگەڵ خەلیفە بەرەو ئەو قوتابخانەیە ڕۆیشـتن کـە ئەمیـنو مەئمون لـەوێ دەیانخوێنـد، کاتێك گەیشـتنە قوتابخانەو چاویان بە مامۆسـتاکەیان کـەوت، خەلیفە هەواڵی ئەمینو مەئمونی پرسی، مامۆستاش وتی: پێش ئێوە مۆڵەتی چەند خولەکێکیان وەرگرتـووەو بۆ کەمێك پشـوودانو یاریکردن چوونەتە دەرەوە، خەلیفە هـارون هەواڵـی تواناو کۆشـشو لێهاتوویـیو زیرەکـی منداڵەکانی لە مامۆسـتاکەیان پرسی، مامۆستاش لە وەڵامدا گوتی: ئەمین کەم تواناترە لە مەئمون، واتە مەئمون زیرەکترو لێهاتووترو بیرتیژ ترە!

لەبەرئەوەی ئەمین منداڵـی خاتوو زوبەیدە بوو، خەلیفەش خاتوو زوبەیدەی زۆر خۆشدەویسـت، وەڵامی مامۆسـتاکەی زۆر پێناخۆش بوو، وتی: هەرگیز بڕوا ناکەم مەئمون لە ئەمین زیرەکتر بێت! ئایا دەتوانیت قسەکانت بسەلمێنیت؟

مامۆسـتاش بۆ سـەلماندنی قسـەکانی تەنها کاغەزێکی خستە ژێر جێگەکەی مەئمونەوە، بەڵام خشـتێکی خسـتە ژێر جێگاکەی ئەمینەوە، دوای ئەم وتوێژە هەردوو کوڕەکەی خەلیفە گەڕانەوە بۆ قوتابخانەکەیانو بینیان ئەوا خەلیفەی باوکیان بەمەبەسـتی هەواڵ پرسـینیان سەردانی قوتابخانەو مامۆسـتاکەیان هاتووە، بەڕێزەوە سلاوییان لە باوکیان کردو بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردو دواتر ڕۆیشـتنە سـەرجێگەکانی خۆیان دانیشتن، هەر کەدانیشتن مەئمون کەوتە بیرکردنەوەو بەملاو لای خۆیدا دەیڕوانیو دیقەتی شـوێنی دانیشـتنەکەی دەدا، مامۆسـتا لە مەئمونی پرسی: بۆچی دەڕوانیت، ئایا هەستت بە شتێك کردووە؟

مەئمون وتی: بەڵێ مامۆسـتا، هەسـتدەکەم بـە ئەندازەی کاغەزێك جێگەکەم بەرز بووەتەوە!

دواتر لە ئەمینی پرسی: ئەی تۆ هەست بە چی دەکەیت؟

ئەمین لە وەڵامدا وتی: من هەسـت بە هیچ گۆڕانکارییەك ناکەم کە ڕوویدابێت!

دواتر مامۆستا بە ئەمینو مەئمونی گوت: ئێوە دەتوانن بڕۆن وانەی ئەمڕۆمـان تـەواو بوو، من کەمێـك لەگەڵ باوکتان قسـە دەکەم، دوای ڕۆیشتنی منداڵەکان مامۆستا بە خەندەوە ڕووی کردە جەنابی خەلیفەو وتی: سوپاس بۆ خودا کە توانیم بۆچوونەکانم بسەلمێنم!

خەلیفـە بەسەرسـامییەوە پرسـی: ئایا هـۆکاری ئـەو جیاوازییە دەزانیت؟

پێـش ئەوەی مامۆسـتاکەیان وەڵام بداتەوە، حەکیم وەڵامی دایەوەو وتی: من وەڵامی ئەو پرسیارەت دەدەمەوە!

خەلیفە هـارون کە بڕوای تەواوی بە وەڵامەکانی حەکیم بوو، وتی: بفەرموو!!

حەکیـم وتی: زیرەکیو لێهاتووی منـداڵ دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی:-

١- ئەندازەی خۆشەویستی دایکو باوك، بۆ یەکتری.

٢- جیـاوازی جۆری خوێنـی دایك لەگەڵ باوکـدا، خوێنی خەلیفە هـارونو خاتـوو زوبەیـدە وەکو یەکە، بـەڵام خوێنی خەلیفـەو دایکی مەئمون جیاوازە..

خاڵی یەکەم ئاماژەیە بۆ ئاشتەوایی ماڵ، بێگومان ئەگەر کەشی ماڵ پڕبوو لە تەباییو خۆشەویسـتیو ڕێزگرتنی یەکتـری، کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر زیرەکیو لێهاتوویی منداڵ.

خاڵی دووەمیش واتە زیرەکی منداڵ پەیوەسـتە بە دایکەوە، حەکیم هـۆکاری زیرەکی مەئمون دەگەڕێنێتـەوە بۆ دایکی، ئەمەش بۆچوونێکی زانستییەو زیاتر دایکان ڕۆڵیان هەیە لە زیرەکی منداڵدا.

حەکیم بۆ هەموو پرسیارێك، وەڵامێکی دروستی لابووە!

# حەز بە چ ڕەنگێک ناکەیت؟

ئەو ڕەنگەی ڕقت لێیەتی، جۆری کەسێتیت دیاری دەکات..

ڕەنگە بەشێوەیەکی خۆنەویستانە، مرۆڤ حەز بە هەندێك ڕەنگ بکاتو ڕقی لە هەندێکی دیکەیان بێت.. بۆ ئەم مەبەستە، دەروونناسان توێژینەوەیکیان ئامادەکردووەو تێیدا لەو دیاردەیان کۆڵیوەتەوە، کە بۆچی مرۆڤەکان، حەزیان بە هەندێك ڕەنگ نییە؟؟

لە ئەنجامدا: گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کە حەزپێنەکردن، یان ڕقلێبوون لە هەندێك ڕەنگ، هەرچەندە کردارێکی خۆنەویستانەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا، جۆری کەسێتیی مرۆڤ، دیاری دەکات.. چونکە مرۆڤەکان، هەریەکەیان حەزو ئارەزوویان جیاوازەو هەمووان تێکڕا بەیەکەوە، ڕقیان لە یەك جۆر ڕەنگ نییە، هەروەك چۆن هەریەکەمان تێڕوانینو بیرکردنەوەمان جیاوازە، بە هەمان شێوە، هەریەکەمان حەزمان بە ڕەنگێکە، هەروەك چۆن هەریەك لە ئێمەش، حەزی بە ڕەنگێك نییە.. کەواتە: لە بابەتی ئەمجارەماندا، با بزانین ئەو ڕەنگەی حەزی پێناکەین، چ جۆرە کەسێتییەکمان بۆ دیاری دەکات:-

١- ڕەنگی خۆڵەمێشی:- ئەگەر ڕقت لە ڕەنگی خۆڵەمێشییەو حەزی پێناکەیت، ئەوا تۆ لە ژیاندا، کەسێکی بێلایەنیت، لە کاتی کێشەو گرفتدا، پشت دەبەستیت بە چارەسەری نیوەناچڵ، یان خۆت دەدەیت بە دەست گرفتو کێشەکانەوە، هەروەها بە سروشتی خۆت، کەسێکی چاپووکو لێهاتووی، توندڕەوانە بەرگری لە هەڵوێستەکانت دەکەیت..

٢- ڕەنگی سوور:- ئەگەر ڕقت لە ڕەنگی سوورە، ئەوا مانای وایە: تۆ ڕقت لە هەڵوێستی زبرو هەستبزوێنەکانە، چونکە تۆ بە سروشتی خۆت، کەسێکیت، حەز بە هێمنیو هێوربوونەوەو ئارامگرتن دەکەیت.

٣- ڕەش:- ئەگەر ڕقت لە ڕەنگی ڕەش دەبێتەوە، لەبەرئەوەیە کە هەست دەکەیت، کە ڕەنگی ڕەش، هەستێکی نەرێنی، لە ناختدا درووست دەکات، سەرەنجام دوچاری بێهیوایی دەبیت.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تۆ، کەسێکی بەسۆزو بەبەزەییت، ڕووداوو بارودۆخی چواردەورت، کاریگەرییان لەسەرت هەیە..

٤- زەرد:- ئەگەر حەز بە ڕەنگی زەرد ناکەیت، بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە تۆ حەزناکەیت، کەس سەرنجت بداتو حەزیش بە ڕووناکی ناکەیت، حەزدەکەیت لە شوێنی خۆت بمێنیتەوە، یاخود دوور لە چاوی خەڵکی، ژیان بگوزەرێنیت، هەروەها تۆ حەز بە هەنگاونانی بوێرانە ناکەیت، هەروەها  لە ژیاندا، حەز بە تاقیکردنەوەی شتە تازەکان ناکەیت، چونکە تۆ کەسێکیت، زیاتر حەز بە ژیانێکی ڕۆتینیو سادەو ساکار دەکەیت.

٥- ڕەنگی پەمەیی:- ئەگەر تۆ حەز بەم ڕەنگە ناکەیت، ئەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە تۆ کەسێتییەکی بەهێزت هەیە، جەربەزەیت، حەز بە تاقیکردنەوەی ئەزموونی نوێ دەکەیت، بەڵام سەبارەت بە ئافرەتان، پێویست نییە نەرمو بێدەنگ بێت.

٦- پرتەقاڵی:- ئەگەر ڕقت لە ڕەنگی پرتاقاڵییە، ئەوا مانای وایە کە ڕقت لە دەنگی بەرزو هەڵسوکەوتی شێتانەیە، هەروەها ڕقت لە هەر کارێکە، کە لە چوارچێوەی یاساو دابو نەریت دەربچێت.

# بنەمای جیاکاری

چیا عەبدوڵا......بەشی یەکەم

«ئەو ڕاستییانەی کە ڕووبەڕوومان دەبنەوە، وەك یەك گرنگییان نییە، بە هێندەی ئەو ڕاستییەی کە مەیلمان بەلایدا دەچێتو هەر ئەمەشیان سەرکەوتن، یان شکستمان بۆ دەستنیشان دەکات».

نورمـان فنسـنت پیـل، بەڕێوەبـەری بینـاکان، لە فەڕەنسـا سـەردانی جێگەیەکـی کـرد، کـە باڵەخانەیەکی گەورەیـان تێدا درووسـت دەکـرد، لە یەکـەم کرێکاری ئـەو بینایـە نزیکبووەوەو لێی پرسـی: چی دەکەیـت؟ کرێکارەکە گوتی: ئـەم بەردە ڕەقانە، بەچەند ئامێرێکی زۆر سـەرەتایی دەشکێنم، دەبێت بەو شێوەیەش بیشـکێنم، کە وەستاکەمان دەیەوێتو لەم گەرما بەهێزەشدا ئارەق دەڕێژم، بەڕاسـتی کارێکە پشتت دەشـکێنێتو ژیانت بێزار دەکات، بەڕێوەبەرەکـە ڕووی لـە کرێکارێکی دیکە کردو لێی پرسـی: ئەی تۆ چی دەکەیت؟ کرێکاری دووەم گوتی: ئەم بەردانە، بەشـێوەیەك ڕێك دەخەم، کە بە کاری بیناکردن بێت، لە پاشاندا کۆدەکرێتەوە، بەو شـێوەیەی کە ئەندازیـاری بیناکە دەیەوێـت، ڕێك دەخرێت، کارێکـە زۆر مانـدووم دەکاتو زۆرجاریش لێی بێـزار دەبم، بەڵام پارەی لێ بەدەست دەهێنم، ماڵو منداڵی پێدەبەم بەڕێوە، لە هیچ باشـترە، بەڕێوەبەرەکە چووە لای کرێکاری سـێیەمو لێی پرسـی: تۆچی دەکەیت؟ کرێکارەکە دەستی بۆ سەرەوە بەرزکردەوەو گوتی: بەڕێز بڕوانە من باڵەخانەی هەوربڕ درووست دەکەم.

ئەم سـێ کرێکارە یەك کاریان ئەنجـام دەدا، بەڵام ڕوانینیان بۆ کارەکەیان، بەتەواوەتی جیاواز بوو، وەك ئابووریناسی ئەمریکی «کلیمان ستۆن» دەڵێت:

**« لە نێـوان خەڵکدا، چەند جیاوازییەکی سـاناو گەورە هەیە، جیاوازییە ساناکان: ڕوانینی خەڵکە بەرامبەر شتەکان، جیاوازییە گەورەکان: ئەوەیە کە ئەرێنیە، یان ئەرێنییە».**

چەند پرسیارێك؟

ئایا پێت خۆشە خەڵك لەدەوروبەرت بێت؟

ئایا تۆ متمانەت بە خەڵك بەو ئاسـتەیە، کەخۆت پێتخۆشـە خەڵك متمانەیان پێت هەبێت؟

ئایا بەخێرایی بڕیار دەدەیت بەسەر خەڵکدا؟

ئایا خۆت بەلێپرسراو دەزانیت بەرامبەر هەڵەکانت، یان لۆمەی خەڵکی دیکە دەکەیت؟

ئایا توانای گاڵتەو شۆخیت هەیەو قبوڵیشی دەکەیت؟

وەڵامدانەوەت بۆ ئەم پرسیارانە، ڕوانینی تۆ بۆ شتەکان دیاری دەکات، بەڵام ئایا پێناسـەی «ڕوانین بۆشـتەکان» چییە لە کوێوە دێت؟ ئایا دەتوانین ڕوانینمان بەرامبەر شتەکان بگۆڕین، ئێستا بە یەکەم پرسیار دەست پێدەکەین:-

پێناسەی «ڕوانین بۆشتەکان» چییە؟ «د.شیت هیلم ستیتەر» دەڵێت: «ڕوانینت بۆ شتەکان، بریتییە لەو بینینەی کە لەڕێیەوە ژیان دەبینیت».

ڕاهێنـەرە تایبەتییەکەم لە یاری تۆپی سـەرمێزدا، بەردەوام پێی دەگوتم: «ژیانت بریتییە لە تیشکە پێچەوانەی ڕوانینەکانت بۆ شتەکان، جائەگـەر ڕوانینت بۆ پاڵەوانێتیەکانت لاوازبوو، ئەوا پاڵەوانێکی لاواز دەبیت، خـۆ ئەگەر ڕوانینت بەهێزبێت، ئـەوا دەبیت بە پاڵەوانێکی بەهێـز». وتەکانی ڕاسـتو درووسـتبوون، بووم بـە پاڵەوانی تۆپی سەرمێز لە میسر بۆ چەند ساڵێکی یەك لەدوای یەك، لە ڕاستیدا گەر سـەیری زۆرینەی خەڵك بکەیت، ئەوانەی کە سـەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێناوە لە ژیاندا، دەبینی کە خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا، ئەویش ڕوانینیان بووە بەرامبەر بەشتەکان، ئەوان لە شکستەکاندا قاڵ نەبوونەتـەوە، بەڵکو لە سـەرکەوتنەکاندا قاڵ بوونەتەوە، نەدەگەڕان بەشوێن هۆکارەکاندا، بەڵکو دەگەڕان بەشوێن چارەسەردا، یەکێك لەو کەسـانەی کە من بە پێشەنگی خۆمی دەزانم، بەردەوام پێی دەگوتم: «ڕوانینـی ئەرێنی تۆیە بەرامبەر شـتەکان، مۆڵەتـی دەرچوونتە بۆ ئایندەیەکی زۆر باشـتر، ئەم شـێوەیە هۆکارو مەبەسـت نییە، بەڵکو ڕێگایـە بۆ ژیان». بەڵێ، ڕوانینت بۆ شـتەکان لەوپـەڕی گرنگیدایە، ئەو ڕاجیاییە، کە جیاوازی زۆر درووسـت دەکات، کلیلی سـەرکەوتنە، ڕەچەتـەی نهێنییە لە پشـتی سـەرکەوتنی سـەرکردەکانو پاڵەوانە وەرزشییەکان، غاندی دەڵێت: **«تاکە شتێك کە دوو کەس لەیەك جیادەکاتەوە، بینینێکی درووستە بەرامبەر شتەکان».**

# چۆن دەبیت بە کەسێکی داهێنەر!

و: تاڤگە شێرزاد یوسف

داهێنان بریتییە لە: پرۆسەی بەرهەمهێنانی شتێك، کە هەردوو چەمکی ڕەسەنو سوودمەندی تێدا جێ ببێتەوە، داهێنان لەبارەی ئەوە دەدوێت، کە بۆ بنبڕکردنی کێشەکان، بتوانرێت ڕێچارەی نوێ بدۆزرێتەوە، ئەمە تەنها بەهرەیەك نییە، تایبەت بێت بە هونەرمەند، نووسەر،... بەڵکو بەهرەیەکی بەسوودە، بۆ هەموو کەسێك، کە بتوانێت توانا شاراوەکانی ناخی پەرە پێبداتو بەکاریان بهێنێت. ئەگەر پێویستت بە هاندانێك بوو بۆ داهێنان، ئەم چەند خاڵە یارمەتیدەردەبن.

* بڕیار بدە بۆ بەرەوپێشبردنی داهێنانت:-

یەکەم هەنگاوە، بۆئەوەی بەتەواوی، بۆ بەرەوپێشبردنی توانای داهێنانت، خۆت تەرخان بکەیت. ڕەنجو ماندووبوونت بە فیرۆ مەدەو ئەرکەکانت دوا مەخە. ئامانجەکانت دیاری بکە، لە یارمەتیدانی کەسانی دیکەدا، بەشداری بکەو لە هەر ڕۆژێکدا، کاتێك بۆ گەشەپێدانی بەهرەکانت، تەرخان بکە.

* ببە بە کەسێکی شارەزا:-

یەکێك لە باشترین ڕێگەکانی برەوپێدانی داهێنان، ئەوەیە کە ببیت بە کەسێکی پسپۆڕو شارەزا لەو بوارەدا. بە هۆی هەبوونی تێگەیشتنێکی دەوڵەمەندانەی بابەتەکە، توانایەکی باشترت دەبێت بۆ بیرکردنەوە لە چارەسەرە داهێنەرە تازەکان بۆ کێشەکان.

*خەڵاتی زانینخوازی خۆت بکە:-

یەکێك لە کۆسپە باوەکانی گەشەپێدانی داهێنان، هەستکردنە بەوەی کە زانینخوازی سەرقاڵبوونە، لە بری ئەوەی هەست بکەیت ئەمە بریتییە لە: هۆشیارکردنەوەی خۆت، خەڵاتی خۆت بکە، کاتێك حەزدەکەیت، لەبارەی شتێکەوە، زانیاری وەدەست بخەیت. ئەو دەرفەتە بدە بە خۆت، بۆ دۆزینەوەی بابەتی نوێو چنگکەوتنی شتی نوێتر.

* ئەوە بزانە کە داهێنان، هەندێك کات خۆی خەڵاتە:-

ئەمە بە گرنگ لە قەڵەم دەدرێت، لە کاتێکدا کە پاداشتی خۆت دەدەیتەوەو خەریکی خەڵاتکردنی خۆتیت، بەڵام ئەوەش گرنگە، کە گەشە بدەیت بە هاندانی ناخت. هەندێك کات خەڵاتی ڕاستەقینەی داهێنانت، بریتییە لە: پرۆسەکە خۆیو سەرقاڵبوونت پێیەوە، نەك بەرهەمەکەی.

* ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکان بە:-

کاتێك بیر لە بنیاتنانی بەهرەکانت دەکەیتەوە، پێویستە ئەوەش بخەیتە بەر چاوت، کە ئامادەی وەرگرتنی مەترسییەکان بیت، بۆئەوەی تواناکانت پێشبخەیت، چونکە هەموو کات، ڕەنگە ڕەنجی ماندووبوونەکانت، دوورینەوەی بەرهەمی سەرکەوتن نەبێت، بەهۆی ئەم خاڵەوە، دەتوانی هانی بەهرە ناوازەکانت بدەیتو زیاتر برەویان پێبدەیت، کە لە داهاتوودا خزمەتێکی باشت دەکەن.

* ترس لە شکست لە ناو ببە:-

ترسی ئەوەی کە ڕەنگە هەڵەیەك بکەیتو شکست بهێنیت لە ماندووبوونەکانتدا، دەبێت بە هۆی گۆجبوونو نەمانی پێشکەوتنەکانت، هەر کاتێك هەست تکرد، کە هەڵگری ئەم جۆرە بیرکردنەوەیت، ئەوە وەبیر خۆت بخەرەوە، کە هەڵەکان، بەشێکی پرۆسەکەن. هەندێجار لە ڕێگەی بەرەو داهێنەریدا، شکست دەخۆیت، بەڵام لە کۆتاییدا، دەگەیت بە ئامانجەکانت.

* نەخشەیەکی عەقڵی لە خەیاڵتدا بسازێنە:-

بۆ کۆکردنەوەی بیرۆکەکانت، نەخشەی عەقڵیی، ڕێگەیەکی مەزنە.. گەڕان بە دوای وەڵامە داهێنەریو نوێخوازییەکان بۆ پرسیارەکان، نەخشەیەکی عەقڵی فەراهەم بهێنە بە هۆی نووسینی بابەتە سەرەکییەکەوە، پاشان زاراوەو بیرۆکەکانت، بە بابەتە سەرەکیەکە ببەستەوە، ئەم تەکنیکە بواری لق لێبوونەوەی بیرۆکەکان دەداتو ڕێگەیەکی بەرچاو دەخاتە بەر دیدمان، کە چۆن بیرۆکەکان پێکەوە بەستراونەتەوە.

* هەوڵی جێبەجێکردنی تەکنیکی شەش کڵاوەکە بدە:-

تەکنیکی شەش کڵاوەکە، بریتییە لە: سەیرکردنی کێشەیەك لە شەش ڕوانگەی جیاوازەوە، بەهۆی جێبەجێکردنی ئەم تەکنیکەوە، دەتوانیت بیرۆکەی تازە بخەیتە ناو لیستی پلانەکانتەوە، کە لە پێشوودا لە یەك، یان دوو خاڵی ڕوانین کەوتۆتە بەر دیدت.

* کڵاوی سوور:- لە ڕوانگەی بەسۆزبوونەوە، لە حاڵەتەکە بڕوانە، هەستەکانت چیت پێ دەڵێن؟

* کڵاوی سپی:- بە لۆژیکی، لە حاڵەتەکە بڕوانە، ڕاستییەکان چین؟

* کڵاوی زەرد:- بە بیرکردنەوەیەکی ئەرێنی، لە بابەتەکە بڕوانە، کامە بەشی چارەسەرەکە، باشتر کار دەکات؟

* کڵاوی ڕەش:- ڕوانینێکی نەرێنی بەکاربهێنە، کام بەشی چارەسەرەکە کار ناکات؟

* کڵاوی سەوز: بە داهێنەرانە بیر بکەرەوە، هەندێك لە بیرۆکە تازەکان چین؟

* کڵاوی شین: بیرت فراوان بکە.. بە گشتی، کام چارەسەر باشترینە؟

سەرچاوە: psychology.about.com

# ئەی مرۆڤ، تۆ بەنرخیت!

بەڵێن ئەنوەر

من دوور نیم، من بە جەستە لێرەم، بەسەر پەیژەی ژیاندا سەردەکەوم، لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەدوێمو تانوپۆی زەمینەی ژیان دەکەم، دێمو دەڕۆم.. دەڕۆم تابووتی مەرگی پاڵەوانەکانی ئەم داستانە دەنێژم، دەڕۆم مەرگی بێوادە سەر دەبڕمو نوێژ دەکەم لە دوای ئەو بانگانەی کە مینبەرەکانیان سووتاندوون، ئەو ستوونانە لە ئامێز دەگرم، کە لە ئاسمانیان ڕفاندوون!

دەڕۆم ئەو ڕیزە تێکدراوانە ڕێکدەخەمەوە، کە لە قامەتیان کردوون، بە یەك هاوار ئەو خەڵکە لە کونجیماڵەکانیان ڕادەچڵەکێنمو دەیانهێنمە سەر شەقامەکانو ڕۆژوی بێدەنگیان پێ دەشکێنم.

ئەی مرۆڤ: دەڕۆم ڕازە درۆینەکان، لە نیازە پاکەکان دەتۆرێنم، دەڕۆم تکا بۆ گیرابوونی نزای منارەکان دەکەمو تۆڵەی سوکایەتیکردن بە پیرۆزییەکان دەستێنم. دەڕۆم مرۆڤ لەگەڵ مانا ڕاستەقینەکاندا ئاشت دەکەمەوەو داوای هیدایەتی گشتییان بۆ دەکەم، تا چی تر بێنرخ نەبن!

ئەی مرۆڤ: من بە جەستە لەگەڵ تۆم، وەکو تۆ بریندارو بێقەرارم، وەکو تۆ بێدادو بێدارم. تۆ نازانیت چەند تاساوم بە زیندەبەچاڵکردنت.. چەند شێواوم بە سووتاندنت.. چەند تۆراوم بە کوشتنت.. چەند گریاوم بە مردنت.. تۆ نازانیت؟!!

چەند جار کلیلی ماڵئاوایی بەسەر گۆڕەکەتدا شۆڕبکەمەوە!؟ چەندجار خوێنی بەناحەق ڕژاوی سەر شەقامو بازاڕەکانت بە فرمێسکەکانم بشۆم!؟ تاکەی هەواڵی کوشتنت بمهەژێنێت؟

تا کەی زوڵمو سوکایەتی پێکردنت، وەکو دێوەزمە، دەست لە بینە قاقام بنێت؟ تا کەی بتەزمو بلەرزم، تاکەی!؟

ئەی مرۆڤ لە تینو تاوی تۆدا ناخم پڕە لە وشەو ڕستە، ویژدانم پڕە لە قسەو هەستو شعورم بەدەم باسی تۆوە لێوانلێوە لە ئیلهامو پێش زامەکانی دڵم کەوتووە، هەستم لە بەرامبەر ئەو بێهەستییەی بەرامبەرت دەکرێت، وەکو گرکان سەما بە مەرگ دەکاتو شێلگیرانە لە بێئۆقرەییدا دەناڵێنێتو لە ماڵو ژیان یاخی دەبێت!

ئەی مرۆڤ: بە چ زمانێك باست بکەم، پێناست بکەمو بتدوێنم؟ من ئێستا زمانی نزام شکاوە، دڵم شکاوە، ڕووخسارم ژاکاوە، تۆ نازانی کە چۆن نزاکانیان لێوەرگێڕاومو دەرگای خۆشەویستی تۆیان لێ داخستوومو وانەی ڕقو تۆڵەیان پێ گوتووم، تۆ نازانی کە چەند لە بیری تۆدام، تۆ نازانیت؟! بەڵام ئەوە بزانە ئەی مرۆڤ من هەرچییەك بم، وەکو تۆ مرۆڤمو لە ئێستاوە بۆ تۆ دەدوێمو لای خودا بە نازەوە نزات بۆ دەکەم، بۆت دەلاڵێمەوە، نوێژ بۆ ئاسودەییت دەکەم، ئەی مرۆڤ تۆ بە نرخیت.

خودایە نازی نزاکانم بکێشەو وەکو مرۆڤ قبوڵم بکە، پێش ئەوەی بە نزاکانم، داوای بەرزیو پارێزگاریت لێ بکەم، ڕێزو شکۆم وەکو مرۆڤ، بپارێزەو بەهای مرۆڤایەتیم بەرز بکەرەوە، خودایە قبوڵم بکە.



# هونەری سکاڵا

و: چیمەن لەتیف

سەرم لەو کەسە سوڕدەمێنێت، کە لەبەرچاوی تۆدا پاڵەوانە، کاتێك پرسیاری هونەری سکاڵای لێدەکەیت؟؟ بە بەڵێ: وەڵامت دەداتەوە، کارێکی نامۆ نییەو سەیرنییە. سەرەتا، وەرە با لەسەر شتێکی گرنگ ڕێك بکەوین، خەڵکی، یاخود زۆربەی خەڵکی، کەسێکیان خۆشناوێت، هەمیشە لە ژیانو بارودۆخ، بە گلەییوگازندە بێت.

ئێمە هەموومان، هەوڵ دەدەین لە کەسێك دوورکەوینەوە، کە بیروباوەڕەکانی لە دەفرێکی ڕەشبینانەدا داناوەو دەیەوێت ڕۆژەکان بەشانەی تاریك، دابهێنێت.. بەهەموو شێوەیەك خۆ بپارێزین لەو کەسانە، یان دیدارو گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین؟ پرسیارەو دەکرێت؟ وێڕای ئەوەی جەخت لەوە دەکەمەوە، بەڵام هەندێك کات پێویستە، ئەوەی لە ناختدایە دەری بهێنیت، گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکدا بکەیت، لەبارەی ئەوەی هزری داگیر کردوویت.

پێویستە بزانین، چەند چرکەیەك هەیە دەبێت ئادەمیزاد بۆ براکەی بێت، مرۆڤ ناتوانێت دوور لە مرۆڤی برای بژیو قسەو گفتوگۆ بکات، تا ئەوەی لەناخیدایە دەری نەبڕێت، دواتر هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژێت، تا خەیاڵی ڕاحەت بێتو ئۆخژنێك بە دەروونی بگات.

با واتایەکی گرنگی دیکە سکاڵات پێ بڵێم، ئەوەش ئەوەیە:- کە سکاڵا، سەرپاکی خراپ نییە!

زۆربەی کات سکاڵا جۆرێکە لەبیرکردنەوە بەمەبەستی بەگژداچوونەوە، یان بە هیوای شکاندنی بارودۆخێکی هەڵەو تێکشاندنی بەربەستێك.

بەتایبەت سکاڵا لەو شتانە نەکەین، کە دەستی ئێمەیان تێدا نییە، ئاوڕ لەو شتانە بدەینەوە، کە لە توانامانداییە بۆ باشتر بیانگۆڕین. سەرەڕای ئەوەی تێکەڵاوبوونێکی زۆر هەیە، لەوەی ڕوودەدات.. وادەکات سکاڵاکانمان چالاك نەبن، لەبری ئەوەی دوای دەربڕینی سکاڵا، هەست بە ئارامی بکەین، زیاتر داهێزراوو بێتاقەت دەبین، یان بەلای کەمەوە سەرکۆنەی خۆمان دەکەینو ئەوی لەناخماندایە بەهاوارکردن گوزارشتی لێدەکەین.

بەڵێ کێشەیە، لەبارەی گرفتێکەوە، بۆ کەسێك قسە بکەیتو ئەو نەتوانێت لەبارەی سکاڵاکەتەوە، کارێك بکات. بۆ نموونە: کەسێك سکاڵای هاوسەرەکەی لای هاوڕێیەکی دەکات، یان لای خێزانەکەی سکاڵای بەڕێوبەرەکەی دەکات، یاخود لەگەڵ شۆفێرێکی تاکسیدا، باسی نارێکی خشتەی کار لە کۆمپانیاکەیدا دەکات.

ساکاڵاکەر لە وەها بارودۆخێکدا، چ سودێك دەبینێت؟! هیچ.. تەنها بێزاری وەرسبوون. ماوەم بدە، با پێت بڵێم سکاڵاکردن لای کەسانێك، پەیوەندییان بەباتەکەوە نەبێت، ڕەنگە مایەی خۆشنوودی بێت بۆ ئەوان.

شێکاری وەها بارودۆخێك ئەوەیە:- کەسێك سکاڵاو بێزاری خۆی لای کەسێکی نەشیاو دەربڕێت، بزانێت ئەو کەسە پیاوی ئەو گۆڕەپانە نییە، ڕاکردنە لە ڕاستییەکانی ژیان، چونکە هێندە بوێر نییە، بە بەڕێوبەرەکەی بڵێت: نا، یان خێزانەکەی کۆبکاتەوەو لەبەرامبەر خێزانەکەیدا بڵێت: من هەڵەم، یاخود کەشێکی تەندرووست، لەگەڵ هاوڕێکانیدا بسازێنێت، ئەو سکاڵای کردووە بە بیانوویەك، بۆ هەڵاتن لە بەرپرسیارێتی.

باشتر وایە ئەو کەسە بوێری پیشان بدات، سکاڵا لە لای کەسێك بکات، لە توانایدا بێت ئاریشەکەی چارەسەر بکات، گرێی دڵی بۆ کەسێك بکاتەوە، کە کلیلی ڕاحەتی گیانو دەروونی پێ بێت.

دووبارەی دەکەمەوەو دەڵێم: پێویستە بەشێوەیەکی هەمیشەییو بەردەوام سکاڵا نەکەیت، بەڵام کاتێك هەست دەکەیت، ڕۆحت قورس بووە، ئەوەی لەناختدایە دەری ببرە، چونکە پێویستت بە گفتوگۆیەکی هێمنانەیە، لەگەڵ هاوەڵێکت، یان حۆشەویستێکت بۆ ئەوەی دەروونو هۆشت پاك بکاتەوە.

پێویستە گفتوگۆ، یان سکاڵاکەت لای کەسێکی گونجاو بکەیت، کە خاوەنرۆحێکی پاکە، تا چارەسەرێکی گونجاو، یان ئامۆژگارییەکی بەردارت بخاتە بەر دەست، یان ئۆخژنێك بدات بە ناخت.

پوختەی بابەتەکە ئەوەیە: تادەتوانیت کەم سکاڵا بکە، زۆری سکاڵا بێسوودە، ئەگەر بارودۆخ ناچاری کردیت، لە هەندێ کاتدا دەردەدڵی خۆت دەربببڕیت، ئەوا لەبەردەم ئەو کەسانەدا گرێی دڵت بکەرەوە، کە سوودت پێدەگەیەنن، یان ئەو ئامۆژگاریو ڕێنماییەت دەکەنو پیشان دەدەن، کە لێیانەوە سوودمەند بیت، ئەو کات ڕووخسەت بخوازەو بزانە چۆن بێدەنگ دەبیتو گوێ دەگریت.

## ئەو منداڵە بێ باوکانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی!

# سوفیانی ئەوری



بەرزان ئەبوبەکر

سـوفیان کوڕی سـەعیدی مەسـروقی ئەوری کوفییە، لە ساڵی (٩٧) کۆچـی لە دایکبـووە، باوکی یەکێك بووە لـە زاناکانی کوفە، بەڵام ڕەنگە سوفیان زۆرسوودمەند نەبووبێت لە زانستەکەی باوکی، چونکـە تەمەنی (٩) سـاڵان بوو کە باوکـی ماڵاوایی لە ژیان کردو سـوفیانی تەنها جێهێشـت، دایکی لە ئامێزی گـرتو زۆر بەجوانی پەروەردەی کرد، هـەر لە تەمەنی منداڵییەوە لە بری ئەوەی وەکو نەریتی ئەو کاتە بینێرێت بۆ پەیداکردنی درهەمو دینار، ناردی بۆ فێربوونی زانستی فەرموودەو کۆڕی زانستو زانیاری، بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان دایکی دەستیکردە تەشی ڕستنو لەو ڕێگەیەوە بژێوی خۆیو کوڕەکەی پەیدا دەکرد، ڕۆژێکیان بەرهەمەکەی فرۆشـت بە (١٠) درهەمو بانگی سـفیانی کردو وتی: کوڕی شـیرینم ئەوە (١٠) درهەمە، بڕۆ فێری زانسـتی فەرمووده ببە، هەرکات هەسـتت کرد ئـەو زانسـتەی فێری بوویـت کاری لە بیروهـۆشو دڵو دەروونو کردەوەت کردووە، وەرەوە تا (١٠) درهەمی دیکەت پێبدەم، خۆئەگەر هیچ کاریگەرییەکی لەسـەر دروسـت نەکردی، ئـەوا واز لە ڕێگەی زانست بهێنە، چونکە زانست تەنها کاریگەری لەسەر کەسانی چاكو دڵسـۆز دروست دەکات.. سوفیان ڕێگەی زانستو زانیاری گرتە بەرو لای چەندین زانای سەردەمی خۆی زانستی فەرموودەی خوێندووە..

**بەهێزی یادگەو بیرتیژی سـوفیان:-** سوفیان خاوەنی زاکیرەو یادگەیەکی بێ وێنە بووە، خۆی دەڵێت: دڵم ماڵاوایی لە هیچ شتێك نەکردووە خیانەتی لێ بکات، هەروەها دەڵێت: گوێچکەشم گوێی لە هیچ شتێك نەبووە لە بیری چووبێتەوە.

* جارێکیان چووە ژوورەوە بۆ لای هشـامی کوڕی عروە، گوێی بۆ وتەکانی گرت، پاشان هەموو ئەوەی کە بیستبووی بێ زیادو کەم بۆ ئامادەبووانی دووبارە کردەوە.

* سـوفیان پێشەوای باوەڕدارانە لە زانسـتی فەرموودەدا، ٣٠٠ سێ سـەد هەزار فەرموودەی لەبەربووە، سوفیان جگە لەوەی زاناو شـارەزاییەکی بێ وێنەی زانسـتی فەرمووده بووە، لە هەمان کاتدا خاوەن وەرەع دونیا نەویستو خوداپەرستێکی بێ وێنە بووە.

**سوفیان خوداپەرستێکی کەم وێنەبوو:-**

سـوفیان لەگەڵ ئەوەی خاوەنی زانستێکی بێ وێنەبوو، بەشێکی زۆری کاتەکانی بۆ خوداپەرستی تەرخان کردبوو، یەکێك لە پێشینان دەڵێت: سوفیانم بینی لە دوای نوێژی مەغریب سوجدەی برد، سەری بەرز نەکردەوە تا بانگی عیشـای فەرموو.. پێشـینێکی دیکە دەڵێت: کاتێك لە کەعبەی پیرۆز تەوافم دەکرد، سوفیانم بینی لە سوجدەدا بوو، حەوت تەوافم کرد، واتە ٤٩ جار بەدەوری کەعبەدا سـوڕامەوە، بەڵام هێشتا سوفیان سەری لە سوجدە بەرز نەکردبووەوە.

سـوفیان زۆرجـار بە درێژایی شـەو تا بەرەبەیـان دەمایەوە، سەرقاڵی عیبادەتو بیرکردنەوە بوو..

یەکێکی دیکە لە سـیفەتی خوداپەرسـتی سوفیان، زۆر دەگریا، زۆر بیری مردنی دەکرد، هەندێك لە پێشـینان دەڵێن: سـوفیان لە هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا بووایە باسێکی مردنی دەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەسێکی دەروون بەرزو دونیا نەویست بووە، هیچ شـتێکی لە کەس قبوڵ نەکردووە، تەنها پشتی دەبەست بە ڕەنجی شانی خۆی، هەمیشە ئامۆژگاری قوتابییەکانی دەکرد کە هەوڵ بدەن لەبەری ڕەنجی شـانی خۆیان بخۆنو داوای هیچ شتێك لـە کەس نەکەن. سـوفیان دەیگوت: کاری پاڵەوانـەکان ئەوەیە کە ڕزقو ڕۆژی حەڵاڵ پەیدا بکەنو بیبەخشـن بە ماڵو منداڵەکانیان، هەموو جارێك دەیگوت: ماڵو سامانی حەڵاڵ، قەڵغانی باوەڕدارە.

سـوفیان لەگەڵ ئەو هەموو دونیا نەویستییەو خوداپەرستییەو زانستو زانیارییەی، کەسێکی قسەخۆشو سوعبەت چی بووە..

**دانراوو بەرهەمەکانی پێشەوا سوفیانی سەوری:-**

یەکەم کەس بووە کە کتێبی سـەبارەت بە زانستی فەرموودەی هەڵبەسـتراو داناوە لە شـاری کوفە، هەروەها دوو کتێبی لەسـەر زانستی فەرمووده نووسیوە بە ناونیشانی (الجامع الکبیر)، (الجامع الصغیر)، هەروەها کتێبێکیشی سەبارەت بە فەرائز نووسیوە.

**وتەی زانایانو پێشینان سەبارەت بە سوفیانی سەوری:-**

پێشەوا مالك لەبارەی پێشەوا سوفیان دەڵێت: جاران عێراق پارەو سامانو پۆشاکی بۆ دەناردین، بەڵام ئێستا سوفیانمان بۆ دەنێرێت!

پێشـەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل سەبارەت بە پێشەوا سوفیان دەڵێت: ئەو پێشەوایەیە کە هیچ کەس پێشی ناکەوێت.

سوفیانی کوڕی عیینەش دەڵێت: زانایانی فەرمووده سێ کەسن،

ئیبنو عەباس، شەعبیو سوفیانی سەوری!

پێشەوا زەهەبی لەبارەی سوفیانەوە دەڵێت: لە زانستی فەرموودەدا پێشەوا بووە، لە فقهدا پێشەوا بووە، سەرکردە بووە لە دونیا نەویستیدا.

دونیانەویستی سوفیان:- سوفیان زانایەك بووە لە زانا ناودارەکان، دارو دەستەکەی ئەبوجەعفەر وتیان سوفیان باشترین کەسە کە بیکەیتە قازی وڵات، ئەبوجەعفەریش فەرمانی کرد بانگهێشتی بکەن بۆ کۆشك، کاتێك زانای پایەبەرز سوفیانی ئەوری گەیشتە کۆشکی خەلافەت، ئەبوجەعفەر پێی گوت: دەمەوێت تۆ بکەم بە قازی وڵات.. سوفیان وتی: بەڵام من بۆ پۆستی قازی شیاو نیم، خەلیفە وتی: نەخێر تۆ دەبیت بە قازی وڵات، دووبارە زانای دونیا نەویست پۆستەکەی ڕەت کردەوەو وتی: من شیاوی ئەو پۆستە نیم، بۆ جاری سێیەم خەلیفە پێداگری کردو وتی: بەڵێ تۆ دەبیت بە قازی.. سوفیان وتی: نەخێر من نامەوێت ببم بە قازی، ئەبوجەعفەر زۆر توڕەبوو، ئاوڕی دایەوەو وتی: شمشێر بەدەست. وتی: بەڵێ قوربان.. ڕاخەرو شمشێر ئامادە بکە، (ڕاخەر: پارچە پێستێك بووە ڕایان دەخست بۆ ئەوەی خوێنەکە بچێتە ناوییەوە نەکەوێتە سەر زەوییەکە).. سوفیان وتی: بە نیازن چی بکەن؟ وتیان ئەتکوژین، وتی: واتە یان دەبێت ببم بە قازی، یان دەمکوژن؟

وتیان بەڵێ، ڕێگەی سێیەم لە ئارادا نییە، سوفیان وتی: زۆرباشە جەنابی خەلیفە، مۆڵەتم بدە تا سبەینێ، خەلیفە وتی: تا سبەی مۆڵەتت دەدەین، بەڵام دوانەکەویت.. سوفیان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك تاریکایی شەو داهات، کەلوپەلەکانی کۆکردەوە، سەرجەمی کەلوپەلەکانی لە نێوباری ئێسترێکدا جێگەی بووەوە، خۆ نە خێزانی هەبوو، نە ماڵو منداڵ، نە ئەوەندەش کەلوپەلی هەبووە تا بە چەند وڵاخێك باربکرێت، تەنها لەسەر پشتی وڵاخێك سەرجەمی کەلوپەلەکانی جێگەی بووەتەوە، بەغدادی بە تەواوی جێهێشت.

بۆ سبەی لە کاتی دیاریکراودا سوفیان ئامادە نەبوو بۆ کۆشك خەلیفە زۆر چاوەڕێی کرد، بەڵام سوفیان دیار نەبوو، دواتر ناردی بۆ ماڵەوە بەدوایدا، دراوسێکانی پێیان گوتن: هەر شەو باری کردووەو ماڵی جێهێشتووە، ئەبوجەعفەر بەم هەواڵە زۆر توڕەبوو، ناردی بۆ سەرجەم ناوچەکان، کە ئەو کات خەلیفە حوکمی شامو میصرو حیجازو نەجدی دەکرد. فەرمانی کرد کە هەرکەس سوفیانم بۆ بهێنێت بە زیندوویی، یان بە مردوویی، خەڵاتێکی گەورەی دەکەم!

سوفیان بەرەو یەمەن بەڕێکەوتبوو، بەڵام لە ڕێگەدا خواردنو پارەی لێ بڕا، هەموو ئەو پارەی پێیبوو، بە هۆی دووری ڕێگەوە تەواو بوو، ویستی کارێك بکات، ڕوویکردە بێستانێکو بە خاوەنەکەی گوت: دەمەوێت مانگێك کارت بۆ بکەم، بۆئەوەی بەو کرێیەی کە وەریدەگرم لەبری مانگێك، بەشی ڕێگەکەم بکات.. خاوەن بێستانەکە ڕازیبوو، بەڵام نەیدەزانی کە ئەو کەسەی کرێکاری بۆ دەکات، سوفیانی ئەورییە، ڕۆژێکیان خاوەن باخ وتی: ئەرێ ئەی لاو، خزمەتکار، سوفیان ڕووی تێکردو وتی: بفەرموو قوربان چیت دەوێت؟

وتی: هێشوویەك ترێی شیرینم بۆ بهێنە، سوفیان هێشویەك ترێی بۆ برد، کاتێك تامی کرد ترێکە ترش بوو، وتی: هێشوویەکی دیکەم بۆ بهێنە، دووبارە ئەو هێشووەش ترش دەرچوو، خاوەن باخ توڕەبوو، ئایا تا ئێستا ترێی ترشو شیرین لە یەکتر جیاناکەیتەوە؟! وتی نەخێر، چونکە تا ئێستا تامی ترێی بێستانەکەی تۆم نەکردووە تا بزانم کامەیان شیرینەو کامە ترشە!! خاوەن باخ بەسەر سامییەوە پرسی: سەیرە، ئەوە نزیکەی مانگێکە لەم باخەدا کاردەکەیت، تا ئێستا تامی ترێی ئەم بێستانەت نەکردووە، بۆچی؟ سوفیان وتی: چونکە تا ئێستا تۆ بە منت نەوتوە دەتوانی ترێ بخۆی، ئیدی چۆن بیخۆم، ترسام لەوەی بێ مۆڵەتی تۆ لە باخەکەت بخۆم، خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکات!! خاوەن باخ سەیری کردو وتی: (ئەگەر سوفیانی ئەوریش بووایە بەو شێوەی تۆی نەدەکرد)..

سوفیان بێدەنگ بوو، خاوەن باخیش ڕۆیشت بۆ دووکانەکەی، ئەو ڕۆژە لەگەڵ هاوڕێیەکی زۆر بەسەر سامییەوە باسی لە هەڵوێستی ئەو کرێکارە کرد، چ وەرێکە یەك مانگ لە باخەکەدا کاردەکات، تامی میوەیەکی نەکردووە.. هاوڕێکەی وتی: شێوەی ئەو کرێکارە چۆنە؟ کاتێك خاوەن باخەکە وەسفی کرێکارەکەی بۆکرد، هاوڕێکەی وتی: ئەو کەسەی تۆ باسی دەکەیت، سوفیانی ئەوری خۆیەتی! خۆزگە سوفیان بێت، ئەو لە دەستی خەلیفە ڕایکردووەو لای تۆ خۆی شاردووەتەوە، وەرە با بیدەین بە دەستەوە تا خەڵاتەکەی خەلیفە وەربگرین، هەردووکیان پێکەوە بەهەڵەداوان بەرەوباخەکە ڕۆیشتن، بەڵام پێش ئەوەی ئەوان بگەنە بێستانەکە، سوفیان بێستانەکەی جێهێشتبوو، بەرەو وڵاتی یەمەن ملی ڕێگەی گرتبووەبەر!

کاتێك والی وڵاتی یەمەن زانی کە سوفیان هاتووە بۆ یەمەن پێی گوت: تۆ ئازادی لەوەی دەتەوێت بمێنیتەوە، یاخود دەڕۆیت بۆ هەر وڵاتێکی دیکە، بەڵام ئەگەر لە ژێر سنوری دەسەڵاتی مندا بوویتایە، ناووناوبانگتم دەپاراست، بۆئەوەی کەس دەستی پێت نەگات.

دواتر گەڕایەوە بۆ شاری مەککەو لەوێ دەستی کرد بە وانە وتنەوەو خزمەتکردن، تا ئەو ساتەی خەلیفە جەعفەر کۆچی دوایی کرد..

دوای ئەوە دەگەڕێتەوە بەغداد، خەلیفە مەهدی پێی دەڵێت: سوفیان لەگەڵمدابە، تا بتوانین بە شوێن ڕێچکەو ڕێبازی هەر دوو عومەردا بڕۆین، بە وێنەی ئەوان دادپەروەربین.. سوفیان لە وەڵامدا وتی: ئەی چی لەو کەسانە دەکەیت کە لە چواردەورتن؟

سوفیان زۆر ئامۆژگاری خەلیفەی کردو داوای لێکرد کە فەرمان بە چاکە بکاتو ڕێگری لە خراپە بکات، ڕەبیع بەرپرسی پۆلیس بوو، لەو کاتەدا لای خەلیفە بوو، کە گوێبیستی سوفیان بوو بەو شێوەیە قسە لەگەڵ خەلیفەدا دەکات، وتی: جەنابی خەلیفە ڕێگەم بدە با لە ملی بدەم؟

سوفیان وتی: پاکوبێگەردی بۆ خودا، ئێوە لە داروودەستەکەی فیرعەون خراپترن، ئەوان وتیان موسا مەکوژە چاوەڕێ بکە تاسبەی، بەڵام تۆ دەڵێی هەر ئێستا فەرمان بدە تابیکوژم.

خەلیفە بە بەرپرسەکەی خۆی گوت: بێدەنگ بە، بەو شێوەیە قسە لەگەڵ سوفیانو هاوشێوەی ئەودا مەکە، ئەوانە دەیانەوێت ئێمە بیانکوژین، بۆئەوەی خۆیان بەختەوەر بنو ئێمەش بەدبەخت بین.

دواتر وتی: سوفیان فەرمانێکت بۆ دەنووسم کە ببیتە قازی وڵات، ئەو فەرمانە جێبەجێ بکە، سوفیان فەرمانەکەی وەرگرتو ڕۆیشتە دەرەوە، لە بری ئەوەی دڵخۆش بێت بەو پۆستە باڵایە، فەرمانەکەی فڕێ دایە ناو ڕووباری دیجلەوە، دووبارە هەڵهاتو ئەمجارەیان بەرەو شاری بەصرە بەڕێکەوت.. سوفیان لە بەسرە مایەوە تا ئەو ساتەی ماڵاوایی لە ژیان کرد.



# کۆترەکەی ئاشتی کرە!

جەلال عەبدوڵا حاجی

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، ڕۆژانە، لە خۆپڕچەککردنو پێشخستنی تەکنیکی شەڕدا، بڕی دوو ملیۆن دۆلار خەرج دەکات، کە دەکاتە چەند هێندەی ئەوەی خەرج دەکرێت، لە سەرتاسەری جیهاندا لە بواری تەندرووستی، یان پەروەردەو فێرکردندا، ئەو بڕەی کە لە شەڕو ململانێکاندا خەرج دەکرێت، بەسە بۆ چاککردنی سەرچاوە سرووشتییەکانو ڕێگریکردن لە بەبیابانبوونو پارێزگاریکردن لە دارستانەکان، هەروەها پاراستنی ژینگە، لە هەموو جۆرەکانی پیسبوون.

ڕۆژی«٦»ی تشرینی دووەم، لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دیاریکراوە، وەك ڕۆژی ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی ژینگە بۆ شەڕو ململانێ سەربازییەکان. مرۆڤ، زیانەکانی جەنگ بە ژمارەی کوژراوو بریندارەکان لێك دەداتەوە، لەگەڵ ئەوەی لە نێوانیاندا داڕووخاوە، کاتێك بەوردی لە جەنگ دەڕوانین لە کۆنو نوێدا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی، پاش نەمانی دەنگی تۆقێنەری تۆپەکان، فڕۆکەکان دەنیشنەوەو لولەی تفەنگەکان سەربەرەوخوار دەکرێن، سەربازەکان بەرەو ماڵەکانیان دەگەڕێنەوە، قوربانیی هەرەگەورە ژینگەیە، مەیدانی جەنگ، شوێنی سەروەرییەکان، ئەو ژینگەیەی وەك قوربانییەکی پشتگوێخراو دەمێنێتەوە، سەرچاوەی ئاوەکان پیسبوون، بەروبوومەکان سووتان، دارستانەکان لەنێوچوون، خاك ژەهراوی بوو، گیانلەبەران کوژران لەپێناو دەستکەوتێکی سەربازیدا. بۆیە دەتوانین شەڕ بەشێوەیەکی گشتی بەوە پێناسەبکەین کە بریتییە:- لە کوشتنو بڕینو کاولکاری، تێکدانی خاكو ئاووهەوا، فەوتانی بەروبوومو هیواکان، تەنها سەرکەوتوویەك تێیدا، ئیرادە سەربازیو سیاسییەکانە. هەندێجاریش ژینگە، سوود لەم ململانێیانە وەردەگرێت! ئەو ناوچانەی لە نێوان وڵاتاندا نابێت چەکی تێدا بەکار بێت، وەك سنوری نێوان هەردوو کۆریا، بە پانی ٤ کم، یان عێراق - کوەیت، یان زۆربوونی ماسی لەو ڕێڕەوە ئاویانەی مین ڕێژکراون، ئەم ناوچانە دەبن بە پەناگەیەك بۆ گیانلەبەرانو بەخاوێنی دەمێننەوە.

مرۆڤ بەردەوام لە ململانێدایە، لەشەڕدا پەنا بۆ هەموو هۆیەك دەبات بۆ خستنو سڕینەوەی بەرامبەر، هەوڵ دەدات باشترین چەکی دەست بکەوێتو بەکاری بهێنێت، بەجۆرێك زۆرترین کەس بکوژێت. لێرەدا باس لە ڕەواو ناڕەوا ناکەین، ئەوەی ئێمە باسی لێوە دەکەین، ئەو ژینگە بێنازەیە، کە بڕیارە نەوەکانی داهاتوو تێیدا بژین. جۆری ئەو چەکانەی بەکاردەهێنرێن، ڕێژەی پیسبوونەکە دیاری دەکەن، ئایا چەکی ئاسایی بەکار دەهێنن (تفەنگ، تەقینەوەو بۆمبی سوتێنەر)، یان چەکی کۆکوژ (کیمیاوی، بایۆلۆژی، تیشکدەرو چەکی ناوکی)، چونکە چەکی ئاسایی دەبێت بە هۆی پیسبوونی هەواو سوتانو کاولکاری لە کاتی ئێستادا، کاریگەری لەسەر ژینگە بۆ داهاتوو، کەمتر جێ دەهێڵێت، بەڵام چەکە کۆکوژەکان دەبن بە هۆی تێکدانو پیسبوونی ژینگەو لەناودانی ژیان، بۆ ساڵانێکی زۆر، کاریگەرییان لەسەر ڕووەكو گیانلەبەرانی ئەو ناوچەیە دەمێنێتەوە. هەرچەندە ئێستا لەو چەکانەشدا ماددەی تیشکدەر بەکاردێت، ئەمەش وای کردووە، ئەو شوێنانەی مەیدانی جەنگن، ڕێژەیەکی زۆر لە ماددەی تیشکدەر بڵاوبێتەوە، هەروەك لە ناوەڕاستو خوارووی عێراقدا دەبینین، ڕێژەی ماددەی تیشکدەر زۆرە، بە هۆی جەنگە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە.

لە ماوەی «٦٠» ساڵی ڕابردوودا، نزیکەی چل لە سەدی ململانێ نێوخۆییەکان پەیوەندی هەبووە، بەخراپ بەکارهێنانی سەرچاوە سرووشتییەکانەوە، هەندێکیان سەرچاوەی بەنرخن وەك: تەختە، ئەڵماس، زێڕو نەوت، یان سەرچاوەی دەگمەنن وەك زەوی بە پیتو ئاو. ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی لێوەبکەین ئەوەیە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناوچەیەکی نەوتییە، ڕێژەیەکی زۆر یەدەگی نەوتی خاوی تێدایە، لە هەمانکاتدا عێراقو بەتایبەتیتر کوردستان، ڕێژەیەکی زۆرباش ئاوی شیرینی هەیە، ئەمەش سەرچاوەیەکی دەگمەنە، لەتەك خاکێکی بەپیتدا، بۆیە کوردستان چاوێکی زۆری لەسەربووە لە ڕابردوواو ئێستاش زیاتر.

کوردستان واتە:- خاك، ئاوو نەوت، لە زۆر جێگەی دنیا ئاو هەیە، بەڵام خاك نییە، یان خاکێکی زۆر هەیە، بەڵام ئاو نییە. هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیو سروشتی سەرنجڕاکێشو بینینی هەر چوار وەرزەکە، حاڵەتێکی ناوازەی درووستکردووە، بەئومێدی خاوێن مانەوەی ناوچەکەمان لە پاش جەنگ، کوردو خەڵکی کوردستان، بەتەمای خاکی هیچ گەلێکی دیکە نین، چاوچنۆکیو ستەمی نێونەتەوەییو دابەشکردنی کوردستان، وایکرد کە ئێمەی کورد بەم شێوازە بژین، دەمێکە کورد لەوە گەیشتووە، ماف نادرێت، دەبێت وەربگیرێت، پێکەوە هەڵکردنی لەگەڵ پێکهاتەکانی دیکە، لەگەڵ کۆمەڵێك سیفەتی باشی دیکەدا، وایکردووە ئەم ناوچەیە زیاتر گرنگی پەیدا بکات، بە هۆی گیانی لێبووردەیی کوردەوە. ئێمە دژی ڕەگەزپەرستین، چونکە خۆمان قوربانی ئەو کارەین، ئێمە دژی شەڕو ئاژاوەین، بەڵام لەبەختی ئێمە «کۆترەکەی ئاشتی کرەو بە تفەنگ نەبێت، لە شەقەی باڵ نادات»!

ئالانی



# بیڵ گەیتس، یەکەم دەوڵەمەندی ساڵی ٢٠١٤

**بیڵ گەیتس، چۆن توانی ببێت بەدەوڵەمەندترین کەسی جیهان؟**

چۆن توانی بیرۆکەکانیو داهێنانەکانی، بگەیەنێت بە ملیۆنان کۆمپیوتەر لە جیهاندا؟ ئایا دەزانیت ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە کۆمپانیاکەی «بیڵ گەیتس» کاردەکەن، لە ژمارەی دانیشتوانی هەندێك لە وڵاتانی دونیا زۆرترە؟

ئایا دەزانیت کە داهاتی «بیڵ گەیتس» لە داهاتی چەندین وڵات زیاترە، کە دانیشتوانەکەی ملیۆنان کەسە؟ ئایا دەزانیت کە زیاتر لە ١٢ ساڵە «بیڵ گەیتس»، دەوڵەمەندترین کەسی دونیایە؟

ئێستا با پێکەوە، کورتەیەك لە ژیانی ئەم کەسە بلیمەتە بخوێنینەوە، کە توانیویەتی لە ڕێگای لێهاتوویی داهێنانیەکانییەوە، ببێت بە دەوڵەمەندترین کەسی جیهان..

«بیڵ گەیتس» واتە «بیڵ ولیام هێنری گەیتس» لە ٢٨ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥، لە سەیاتل لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەدایکبووە، باوکی «بیڵ گەیتس» پارێزەر بووە، لە هەمان کاتدا، زۆر لە خەمی کوڕەکەی بیڵو هەر دوو خوشکەکەیدا بووە، دایکی «بیڵ گەیتس»، لە زانکۆی واشنتۆن، وانەبێژ بووە.. دایکی هۆکاری سەرەکی بووە بۆ ڕێکخستنو بەرەوپێشبردنی ژیانی کوڕەکەی بیڵ.

لەگەڵ ئەوەشدا کە خێزانی «بیڵ گەیتس» دەوڵەمەندو خاوەنی سامان بوون، بەڵام «بیڵ گەیتس» ڕازی نەبووە، تەنها یەك دۆلار بۆ دروستکردنو دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتەکەی خەرج بکات، تەنها لەو پارەو سامانەی خەرج کردووە، کە بەرهەمو ماندووبوونی خۆی بووە.

«بیڵ گەیتس» لە منداڵیدا، کەسێکی خەمسارد بووەو گرنگی بە خۆیو جلوبەرگەکانی نەداوە، بەڵام هەرگیز کاتەکانی خۆی بە فێرۆ نەداوە. یەکێك لە هاوڕێکانی لەبارەی «بیڵ گەیتس»ەوە دەڵێت: گەیتس لە هەمووومان زیرەکتر بوو، بەڵام کەسێکی زۆر خاکیو بێفیز بوو، هەرگیز شانازی بە خۆیەوە نەدەکرد، لە تەمەنی دە ساڵیدا، وەکو کەسێکی گەورە قسەی دەکرد، ئاستی بیرکردنەوەی گەیتس، زۆر لە ئاست بیرکردنەوەی ئێمە، بەرزتر بوو.

ساڵی ١٩٦٧، گەیتس پەیوەندیی کرد بە قوتابخانەی لایکساید، کە قوتابخانەیەکی تایبەت بوو، تەنها خێزانە دەوڵەمەندەکان، دەیانتوانی منداڵەکانیان بۆ ئەو قوتابخانەیە بنێرن، قوتابخانەکە تایبەت بوو بە کوران، گەیتس لە بیرکاریدا، کەسێکی زۆر زیرەكو لێهاتوو بوو، لە ساڵی ١٩٦٨ قوتابخانەکە بڕیارێکی دەرکرد، کە بوو بە هۆکاری گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانی گەیتس، بڕیاری قوتابخانەکە بریتی بوو لە:- کڕینی کۆمپیوتەرێك کە ناوی «ISR«Teletype»» بوو، گەیتس لە هەمووان زیاتر، خۆی بەم کۆمپیوتەرەوە، سەرقاڵ کرد.. لەگەڵ هەردوو هاوڕێی «ئیفاتسو بول» کە ئەوان بە دوو ساڵ لە گەیتس گەورەتر بوون، گەیتس لەبارەی ئەو کۆمپیوتەرەوە دەڵێت: کۆمپیوتەرێکی گەورەو زەبەلاح بوو، بەڵام خاوو بێزارکەر بوو.

گەیتس لە تەمەنی «١٤» ساڵیدا، کورتەبەرنامەیەکی نووسی، کە بەرنامەی یاریکردن بوو، بە ناوی: تیك تاك تۆ.. بە زمانی بەیسك، قوتابخانەکەی، بە بڕی «٤٢٠٠» دۆلار، لێی کڕییەوە.

لە ساڵی ١٩٦٩دا، بیڵ گەیتسو بول ئالن، کۆمپانیایەکیان بە ناوی «کۆمەڵەی بەرنامەسازانی لیکسایر بۆ کۆمپیوتەر..» دامەزراند، ئەمە بوو بە خاڵی وەرچەرخانی ئەم دوو قوتابییە، گەیتسو هاوڕێکەی، توانیان کۆدی نهێنی کۆمپیوتەری کۆمپانیاکە بشکێنن، کە تایبەت بوو بە دەرکردنی پسوڵەی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر، تێیدا نرخی پسوڵەکانیان دابەزاند. ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی گەیتس سزا بدرێت، بەوەی کە ماوەی شەش هەفتە، نابێت کۆمپیوتەر بەکاربهێنێت.

لە ساڵی ١٩٧١دا، کۆمپانیاکەی «کۆمەڵەی بەرنامەسازی لیکسایر بۆ کۆمپیوتەر» یەکەم هەلی کارکردنی بە دەستهێنا، کە بریتی بوو لە نووسینی پرۆگرامێك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانبەران، بۆ کۆمپانیا ناوخۆییەکان.

دواتر گەیتسو بول ئالن، یاسایەکیان، بۆ کەمکردنەوەی فەرەبالغی ناوشار، داهێنا.. پاشان کۆمپانیایەکی دیکەی لەگەڵ هاوڕێکەیدا "ئیفانتس" بە ناوی «**logic simulation company**» دانا، هەروەها بۆ فراوانکردنی کۆمپانیاکەی، هاوڕێکانی قوتابخانەی بانگهێشت کرد، بۆ پەیوەندیکردن بە کۆمپانیاکەوە.

لە ساڵی ١٩٧٢دا، گەیتس قۆناغی ئامادەیی تەواو کرد، لە ساڵی ١٩٧٣شدا، پەیوەندیی بە زانکۆی هارفاردەوە کرد، بۆئەوەی لە کۆلێژی یاسا بخوێنێت، لە هەمان پیشەی باوکیدا. بەڵام حەزی زۆری بۆ زانستی بیرکاریو سەرکەوتنی لەو بوارەدا، بوو بە هۆی ئەوەی کە گەیتس، نەیتوانی لە خوێندنی یاسادا، سەرکەوتوو بێت. دواجار بە خۆی گوت: ئەگەر نەتوانم سەرکەوتوو بم، بۆچی لەم بوارەدا کار بکەم!!

لەبەرئەوە لە بواری کۆمپیوتەریدا ڕۆچوو، ڕۆژانە چەندین کاتژمێر لە نێو کۆمپانیاکەیدا کاری دەکرد، زۆر جار تا چواری بەرەبەیان دەمایەوە، ڕۆژێکیان هاوڕێکەی بول ئالن، وێنەی لاپتۆپێکی لەسەر بەرگی گۆڤارێك بینی، بەپەلە هات بۆلای گەیتسو ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاند، دواتر پەیوەندییان کرد بەو کۆمپانیایەی دروستی کردووە، کۆمپانیاکە داوای جێبەجێکردنی بەرنامەیەکی کۆمپیوتەری ئاسانی لێکردن، هەردووکیان سەرقاڵبوون بە دروستکردنی بەرنامەکەوە بۆ ماوەی هەشت هەفتە، ئنجا توانییان داواکەیان جێبەجێ بکەن، کە پەرەیان بە زمانی بەیسك دا، بۆئەوەی لە کۆمپیوتەری «MITS Altair»دا بەکار بێت.

ساڵی ١٩٧٥، گەیتس لەگەڵ هاوڕێکەیدا، کۆمپانیای «مایکرۆسۆفت»یان دامەزراند، دەستیان کرد بە کارکردن بۆ ساغکردنەوەی پرۆگرامەکان، کە لە لاپتۆپدا، بەکار دەهێنرێت. لە ساڵی یەکەمدا، تەنها ١٦٠٠ دۆلاریان دەستکەوت.. لەو ڕۆژەوە، گەیتس زۆر گرنگی بە کۆمپانیاکەی دا، هەستیکرد کە خوێندن تەنها کاتی دەکوژێت، لەبەرئەوە بڕیاری دا، کە واز لە خوێندنەکەی بهێنێتو بە تەواوی خۆی بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت تەرخان بکات.

گەیتس توانی لە پلانەکەیدا، سەرکەوتوو بێت، ماوەی چەند ساڵێك شەوو ڕۆژی خستە سەریەك، بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانی، بەردەوام کاری دەکرد، لە کۆتاییدا توانی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی دارایی، لەسەر ئاستی جیهان دابمەزرێنێت، کە تەنها یەك کەس خاوەنییەتی لە جیهاندا، ئەویش «بیڵ گەیتس»ە.

گەیتس تەمەنی تەنها «٢١» ساڵ بوو، هەمیشە بە ڕوخسار پێنج ساڵ، لە تەمەنی خۆی، کەمتر دەردەکەوت، بەڵام بە عەقڵو ژیری، زۆر لە تەمەنی خۆی گەورەتر دەردەکەوت، ئەمەش بوو بە هۆی یادەوەرییەکی خۆش بۆ گەیتس، ڕۆژێك دەچێتە ژوورەکەی خۆیو کۆمپیوتەرە تایبەتەکەی هەڵدەکاتو دەست دەکات بەکارکردن، لەو کاتەدا سکرتێرەیەك، کە یەکەم ڕۆژی بوو، دەوام بکات، بەپەلە پەیوەندیی بە یەکێك لە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکەوە دەکاتو دەڵێت منداڵێك هاتۆتە ژوورەکەی جەنابی بیڵ گەیتسەوەو یاری بە کۆمپیوتەرە تایبەتەکەی دەکات.. کاتێك وەسفی منداڵەکەی بۆ دەکات، بەڕێوەبەرەکە بە خەندەوە پێی ڕادەگەیەنێت، کە ئەو منداڵەی تۆ باسی لێوە دەکەیت، جەنابی بیڵ گەیتس خۆیەتی!!

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨١دا، مایکرۆسوفتی وەکو کۆمپانیایەك ناساند، لە هەمان ساڵدا «ABM» خستە ڕوو. کۆمپیوتەرە تایبەتەکەی خۆیشی، کە لەسەر یاسای کارپێکردنی مایکرۆسۆفت، کار دەکات. خاوەنی «١٦» بایتو لەسەر «ئێم ئێس دۆس ١٠٥» بووە ئەو پاسپۆرتەی کە مایکرۆسۆفتی بە سەرکەوتوویو ناوبانگێکی باشەوە، بە هەموو جیهان ناساند.

پاش دوو ساڵ بیڵ گەیتس، لە پێشانگای کۆمدێکس پلانی بۆ پرۆگرامسازییەکی نوێ، بەناونیشانی «ویندۆز» ڕاگەیاند..

سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی گەیتس، تا ئەمڕۆش بەردەوامە، کۆمپیوتەرە تایبەتەکان، بوونە بە پێویستییەکی ڕۆژانەی زۆرێکمان.. ڕێگای پێشکەوتنو دەوڵەمەندبوونی گەیتس، گوڵڕێژ نەکرابوو، بەڵکو چەندین نارەحەتیو تەنگو چەڵەمەی هاتۆتە پێش، بەجۆرێك ئەگەر هەر کەسێکی دیکە بووایە هەر زوو شکستی دەهێناو وازی لە کارەکەی دەهێنا.. زۆرێك لە نەیارەکانی ویستوویانە شکستی پێبهێنن، زۆرجار سکاڵایان لە دژی تۆمار کردووە، بۆ ڕزگاربوون لەو تەنگژانە، چەندین جار ملیۆنان دۆلار غرامە کراوە.. بەڵام هیچ کۆسپو نارەحەتییەك، نەیتوانیوە چۆك بە گەیتس دابدات بۆ گەیشتنی بە هیواو خەونەکانی.

## چەند ڕاستییەك لەبارەی گەیتسەوە:-

* لە ڕیزبەندیی دەوڵەمەندترین کەسەکانی جیهاندا، لەماوەی«٢٠» ساڵدا توانیویەتی «١٥» جار پارێزگاری لە ناونیشانی «یەکەم دەوڵەمەندی جیهان» بکاتو بە یەکەمی دەوڵەمەندەکانی جیهان ناوزەد بکرێت.

* شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێسی دووەم، لە ساڵی ٢٠٠٥دا نازناوی شەرەفی سوارچاکی بە بیڵ گەیتس بەخشی، بەهۆی کارە خێرخوازییەکانی لەسەرانسەری جیهانو بەشداریکردنی لە کاری پرۆگرامسازی لە بەریتانیادا.

* بڕی ئەو پارەو سامانەی، گەیتس لەسەرجەم بوارە مرۆییەکاندا بەخشیویەتی، دەگاتە «٢٣» ملیار دۆلار، لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا، بە جۆرێك بۆ هەر ساڵێك زیاتر لە پێنج ملیار دۆلاری بەخشیوە.

* لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا سامانو سەروەتی بیڵ گەیتس لەسەرو ئالتونی یەدەکی هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بووە، ئەمەش بوو بە هۆی لاوازکردنی مامەڵەکردن بەدراوی کاغەزەوە لە ئەمریکادا، هاوکات ئەو بڕە پارەیە، زیاتر بوو لە داهاتو بەرهەمی ١٤١ دەوڵەت لە جیهاندا.

* گەیتس خاوەنی زۆرترین کۆمەڵەی خێرخوازییە لە جیهاندا، صندوقە خێرخوازییەکەی ملیۆنان دۆلاری بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئایدزو کڕینی دەرمان بۆ کوتانی منداڵان دژی ئیفلیجی لە وڵاتانی سێیەمداو بۆ ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانی سیلو مەلاریا خەرج دەکات، هەروەها بەخشینی کۆمپیوتەر بەسەر چینی هەژاراندا لە ئەمریکاو چەندین وڵاتانی دونیا.

* گەیتس جگە لە نازناوی دەوڵەمەندترین کەسی دونیا، لە ساڵی ٢٠٠٤ — ٢٠٠٥ نازناوی بەخشندەترین خێرخوازی جیهانی پێبەخشرا.

* لە داهێنانە بێوێنەکانی گەیتس، ویندۆزە، کە زیاتر لە ٩٠٪ کۆمپیوتەرەکانی هەموو جیهان بەو بەرنامەیە کاردەکات.

* بیڵ گەیتس لە هەر چرکەیەکدا «٢٥٠» دۆلاری دەستدەکەوێت، واتە «١٥٠٠٠» پانزە هەزار دۆلار لە یەك خولەکدا، کە دەکاتە «٩٠٠٠٠٠» نۆسەد هەزار دۆلار لە کاتژمێریکدا، ئەوەش دەکاتە «٢١٦٠٠٠٠٠» بیستو یەك ملیۆنو شەش سەد هەزار دۆلار لە ڕۆژێکدا، لە ساڵێکدا دەکاتە «٧٨٨٤٠٠٠٠٠٠» حەوت ملیارو هەشت سەدو هەشتاو چوار ملیۆن دۆلار.

گەیتس سەرەڕای ئەو هەموو سەروەتو سامانو ناوبانگە، کەسێکی خاکیو بێفیزە، کەسێکی زۆر بەخشندەیەو ساڵانە بە ملیار دۆلار دەبەخشێت.

# ئاوازێک بۆ نیشتمان

ڕۆشنا صاڵح

لەسەر لوتکەی کام چیات
چەشنی بولبول، بخوێنم بۆت
بڵێم: ئێمەش خاوەن خاكو خاوەن مافین
نیشتمانم تۆ پێم بڵێ:
لەسەر چەشمەی کام کانیتا
دەستنوێژ بگرمو پڕ بە دڵم دوعا بکەم
بڵێم: خوایە نیشتمانم هەر تۆی هەیە.. بیپارێزە
بڵێم: خودای ئاگاداری دیارو نادیار
خۆت شاهیدی، چەندە تەنیاو مەحزونین
بست بە بستی خاکمان، خەڵتانی خوێنی ڕۆڵەکانی
نیشتمانمانە، لە پێناو ئازادیمانا!
لەبن هەرچیاو هەردێك تێپەڕین، کێلی گۆڕی شەهیدانمان
شاهیدی قوربانیمانە!
نیشتمانم، بە گەرووی دڵم
چەشنی نەی، بۆت بخوێنم
جگە لە ناڵەی دڵە بێحاڵو تەنهاکەت
جگە لە کسپەی هەناوە گڕگرتووەکەی دایکانت
هیچ ئاوازێکی دیکە، لە زارم ناپرژێو گەرووم
بەدەر لە ئازارو میحنەتت، هیچ ئاوازێکی دیکە ناچڕێ!!
نازانم دەبێ تاکەی
نەوەکانی سەلاحەدینت
لە ژێر چوارپەلی داگیرکەرا
هەرتاڵاوی ژانی ژیان بکرێ بە گەروویانا
دەبێ تاکەی
شەڕی بەردەقارەمانەکان
لەسەرخاكو سنگی ڕۆڵەکانت بەردەوام بێو
شێخ مەحمودەکانی وڵاتم
یەك لە دوای یەك، بە پلانی ناحەزانی گەلو خاکم، شەهید بکرێن!
بۆ دەبێ بۆ ئازادی
سەرکردەو لاوەکانت
لەناو بەندیخانەی نەیارانا
ئازادییان زەوت بکرێ؟؟

لە کاتێکا وەك ئەوان بە ئازادی خولقێنراوین
خاوەن زمانو کەلتوورین
لە ناسنامەمان ئازادیو
لە بەرنامەمان یەکسانیو
لە برایەتیمانا میانڕەویو
لە دینمانا ڕێزو شکۆ، بۆ مرۆڤایەتی پەیڕەو دەکرێ!
خودایە...
ئێمە لە مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریسی مامۆستای تەفسیرو
لە نەورەسی پەیامی نورینو
لە داستانی مەمو زینو
لە میرنیشینی مەردایەتیو
لە حەپسەو عادیلەخانی خاوەن حەیاو شەرمو
لە عوسمانی کنالەیلو
لە دیوانی شیعری سێکوچکەی بابانو
لە مونەوەری مەعنەویەتی مەحویو
لە پێدەشتی خاكو خۆڵی پڕ بەرهەمی نالیو
لە ڕێبازی چوار ئەفسەری لە سێدارەدراو
لە ڕووباری خوێنی شەهیدانی شاری ئەحمەد موختارو جافانو
لە نوگرەسەلمانێك ئەنفالی گەرمیانو بارزانو
لە بیابانێك بێسەرو شوێنکراوانو
لە بابەگوڕگوڕێکی هەناو گڕگرتوو، بۆ ئامێزی نیشتمانیو
لە بەهاری هاوینەهەواری سەیرانگاکانی کوردستان
کە پڕە لە چرۆی ئەوینو هیواو ئیرادەو کۆڵنەدان
لە بەفراوی سەرچیاکانی قەندیلو حەمرینو شنرۆێمان
کەبێگەردو خاڵییە لە خاشاکی داگیرکەریو چاوچنۆکان..
لەمە زیاتر هیچمان نییە!
هیچمان ناوێ!
هیچتان نابەین!
هیچمان مەبەن!
باش بشزانن نەیاران
لەپێناو یەکخستنو سەربەخۆیو شەکانەوەی
ئاڵای دەوڵەتی کوردستان، هەرگیز ماندوو نابینو کۆڵ نادەین!

# بابە هاتەوە، پێی دەڵێم..

بێگەرد فارس

بابـە هاتەوە، پێـی دەڵێم، ئەگەر باوکـت بزانێت لێت دەدات، بە باوکت دەڵێم سـزات بدات، ئەو وشانەی هەندێك لە دایكان زۆر دووبـارەی دەكەنەوە، بێئـەوەی درك بە ترسـناكی ئەو هەڵەیەی دەیـكات بـكات، چ بەرامبەر بـە باوكەكـە بێت، یـان منداڵەكە، لەو كاتەی بەرپرسـیارێتی سەرشـانی دایكەكە لە درووسـتكردنی پەیوەنـدی بەهێزو سۆزوخۆشەویسـتی نێوان بـاوانو منداڵەكانی دەسـت پێدەكات، بەهۆی ئەو بارودۆخەی هەیەتی دەسـتدەكات بە وتنی ئەو وشانە، بێئەوەی بزانێت چ ئەنجامێكی خراپی هەیە! ئەو ئەنجامانەش:-

* درووسـتكردنی وێنەیەكـی ترسـێنەری باوكی، لە مێشـكی منداڵەكەیدا، بە جۆرێك گران دەبێت ئەو خۆشەویسـتییەی باوكی پێی دەبەخشێ، وەریبگرێت.

* وێنەی نموونەیی باوكی لە مێشكی ئەو منداڵە دەشێوێنێت، هەرچەندە پێویستە سەرچاوەی ئاسایشو دڵنیاییو پاراستنی بێت، نەك ترساندنی.

* تێگەیشـتنی منداڵ بەوەی كە دایكـی خاوەنی بڕیار نییەو ناتوانێت پاداشت، یان سزای بدات، هەر بۆیە گرنگی بە هیچ وتەو كردارەكانی دایكی نادات.

* بێزاربوونـی باوكان لەوەی كە چاوەڕێیان دەكات لە ناوماڵدا بەهۆی گلەیی و گازندەی دایكان بەرامبەر ڕەفتاری منداڵو پاشانیش ناچار بوونیان بە توڕەبوونو سزادانیان، ئەمەش سەرەڕای بێزاریی، ماندوویان دەكات.

* ئەگـەر دایك تەنها هەڕەشـە بكاتو سـكاڵای ڕەفتارەكانیان نەگەیەنێت، ئەوە ڕاسـتگۆیی خۆی لای منداڵەكانی لەدەسـتدەدات، ئەوانیش گوێی پێ نادەن، چونكە دەزانن تەنها هەڕەشەیەو بەس.

* ئاڕاستەیەكی نائاگایی لەلایەن باوكەوە درووستدەبێت، بەوەی كـە پەیوەندی ئەوو منداڵەكەی تەنها پەیوەندی سـزاو پاداشـتە، وای بـۆ دەچێـت هەر كاتێك داوای یارمەتی لێكـرا دەبێت ئەو بە توندوتیژی مامەڵە بكات، ئەمەش گفتوگۆی هێمنانەو لەسـەرخۆی لەگەڵ منداڵەكەی گران دەبێتو بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ منداڵەكەی ناكۆكی تێدەكەوێت.

پێویسـتە دایـك ڕۆڵی درووسـتكردنی پەیوەندییەكی دروست ببینێت، لە نێوان باوانو منداڵەكانی ئەویش لە ڕێی:-

* پەیوەنـدی تەلەفۆنی لە نێوان باوكیو منداڵەكەی ڕێكبخات پێـش گەڕانەوەی لە كار، بـۆ هاندانی لە چاوەڕێكردنی گەڕانەوەی باوكیو دڵخۆشبوون بە گەڕانەوەی.

* منـداڵ وا هەسـت دەكات هۆكاری دەربڕینی خۆشەویسـتی لایەنـی مادییـە، هەربۆیە ئەگـەر پارچە كێكێكـی بچوكیش بێت هەوڵبـدات، وەك دیـاری ببیبەخشـێتە منداڵەكـەی، كاتێك لە كار دەگەڕێتەوە.

* بارودۆخی ئێسـتە وا پێویسـت دەكات باوك ماوەیەكی زۆر بەهـۆی كارەوە لە دەرەوە بێت، بـاش وایە دایك بیری منداڵەكەی بخاتـەوەو گرنگـی كارەكـەی باوكـی بـۆ ڕوون بكاتـەوە، كە بۆ بەختەوەری ئەوان خۆی ماندوو دەكات.

* دایك هانی منداڵ بدات لە كردنی چەند كارێكی بەسوودو پێی بڵێت:- باوكت بەو كارەت زۆر دڵخۆش دەبێت، یاخود پێی بڵێ بیرت نەچێت بە باوكت بڵێیت من لە كارەكەم سەركەوتوو بووم، ...هتد.

* دووبارەكردنەوەی چەند وتەیەك وەك:- «تۆ خۆشەویسـتی باوكتـی، یان باوكت زۆری خۆشـدەوێت، یاخود باوكت زۆر بیرت دەكات، هەركاتێـك لە كارەكەی تەواو بـوو، دەگەڕێتەوەماڵەوە بۆ بینینت».

* كاتـی گەڕانـەوەی باوك لە كارەكەیو پاش سـڵاوكردنی لە هەمـووان، باشوایە دایك منداڵەكانی لەگەڵ خۆی بە ئامادەكردنی خوان بۆ ئەوەی كەمێك باوكیان بحەسێتەوە، چونكە كاتێك پێكەوە ئامـادەی خوان دەبـن ماندوویی حەسـاوەتەوەو دەتوانێت كاتێكی خۆش لەگەڵ منداڵەكانی بەسەربەرێت.

* دانانی خشـتەی بۆنەكان، تایبەت بە بۆنەی منداڵەكە بێت، یان قوتابخانەیو بیرخسـتنەوەی باوكی منداڵەكانو پێكەوە كاری لەسەر بكەن.

* دووركەوتنـەوەی دایـك لەوەی ڕۆڵـی ناوەندێك ببینێت لە نێـوان گفتووگۆی باوكو منداڵەكانیدا، پێویستە ڕێز لەوە بگرێت ڕووبەڕێـك بـۆ پەیوەندییەكانیـان هەبێت، ڕاسـتەوخۆ نەك ئەو هۆكاری گەیاندن بێت.

* ڕێككەوتن لەسـەر سـوپرایزو سـزا گـەورەكان پێشوەخت لەلایـەن باوانەوە بۆ ئەوەی منداڵ بەشداری گفتووگۆی نێوانیان نەبێت.

* لـە كاتی بوونی هەر جیاوازیو كێشـەیەكدا، پێویسـتە بە تـەواوی منـداڵ دووربخرێتەوە بۆئەوەی بـەو بارودۆخە كاریگەر نەبن.

لە كۆتاییدا باشـترین دیاری كە دایكوباوك دەتوانن پێشكەشی منداڵەكانیان بكەن، ئەوەیە كە یەكتریان خۆشـبوێتو كەشێكی پڕ لە خۆشەویستیو دڵنیاییو ئارامی لەناویاندا پەخش بكەن.



# هەڵسوکەوتی مێردمنداڵەکان، دووبارەکردنەوەی هەڵسوکەوتی ئێوەیە!

هەڵسوکەوتی مێردمنداڵەکانتان ئازارتان دەدات؟ ئەو زۆر بە سادەییو بە ئاسانی یاساو پێودانگەکانی خێزان، دەخاتە ژێر پێی، ئەم کارە پەیوەندی بە ئەندازەی فێرکردنی ئێوەوە هەیە، واتە چۆن دەتوانرێت هەڵسوکەوتە باشەکان لە منداڵدا پڕ ڕەنگ بکرێتو جوان بکرێت. لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا، کاتێك کە هەڵسوکەوتە نەشیاوەکان، لە ڕاگەیاندنەکانەوە نمایش دەکرێن، هەموو ڕێگاکان کراوە دەبن، تا مێردمنداڵ بکەوێتە داوی بەدکرداریو توندوتیژییەوە، بەڵام هێشتا بۆ فێرکردنی هەڵسوکەوتە باشەکان بە منداڵەکان، درەنگ نەبووە.. ئێوە بە دابینکردنی کات بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانتان، کارامەییو شارەزاییەکی وایان بەسەردا زاڵ دەکەن، کە بۆ ئەو تەمەنەی ماویانە، کەڵکی لێوەربگرن.

ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە، زیاتر یارمەتیتان دەدات:-

١- ئامانجەکانتان بە ڕوونی دەرببڕن:- یەکێك لە قۆناغە سەرەکییەکانی ژیانی هەر تاکێك، ئاشنابوونو درك پێکردنی پێوەرو بەها خێزانییەکانییەتی. دووبارەکردنەوەو گوتنەوەی ئەم پێوەرانە، بۆ مێردمنداڵەکان دەبێت بە هۆی ئەوەی کە هەنگاو بەرەو ژیانێکی ئامانجدار هەڵبگرن، ئەو بە ڕوونبوونەوەو دركکردن بە چاوەڕوانییەکانی خێزان، زیاتر ئارەزووی پەیڕەوکردنی دەکات.

پەروەردەکردنی منداڵو مێردمنداڵی بەئەدەب، خواستو ویستی هەموو خێزانێکە، لەم نێوەندەشدا، بەهێزکردنی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە دەبن بە ڕەگوڕیشەی هەڵسوکەوتە سەرەکییەکان، گەیشتن بەم ئەرکە ئاسانتر دەکات.

٢- هەڵسوکەوتی دایکو باوك، کاریگەریی دەبێت لەسەر بەهێزکردنو هاندانی هەڵسوکەوتی مێردمنداڵ:- لە ڕاستیدا دایکو باوك، بە هەڵسوکەوتی خۆیان، بە ناڕاستەوخۆیی، شێوەی ژیان فێری مێردمنداڵەکانیان دەکەن. بۆ نموونە:- چەند دەستەواژەیەکی وەك «سوپاست دەکەم»و «تکایە»، «بە شێوە میهرەبانییەکەی» منداڵ فێری ڕێزگرتن دەکات.

٣- ڕێکوپێك بن:- ڕێکوپێکبوونی دایکو باوك، یارمەتییەکی سەرنجڕاکێشو بە ئامانجداربوونی ژیانی منداڵو مێردمنداڵ دەداتو بە درێژایی ماوەی ئەم ئەرکە، کاریگەری بەرچاوی خۆی لەسەر هەڵسوکەوتی منداڵدا پیشان دەدات. ئەم ئەرکە، یارمەتیمان دەدات، کە ئەگەر مێردمنداڵ، بەباشی کار بە ئەرکەکانی خۆی ناکات، لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکەین، لە ڕاستیدا هەڵسوکەوتی ڕاستو درووستی دایکانو باوکان، ڕێنمایی مێردمنداڵ دەکات، بەرەو بواری سەرەکی.

پێی بڵێن: کە هەڵسوکەوتو کردەوەی باش، چۆن ژیانی دەگۆڕێت. هەر هەڵسوکەوتێك، کە منداڵ لە یەکەم ڕۆژەوە، لە خێزانەکەیدا فێری دەبێت، بە تێپەڕبوونی کات، دەبێت بە نەریتو هەتا هەڵسوکەوتەکان لەبارترو شیاوتر بن، دەبن بە هۆی ئەوەی کە سەرکەوتووانەتر، کار بکات.

٤- با هەڵسوکەوتتان باش بێت:- مێردمنداڵ هەموو هەڵسوکەوتەکانی دایکو باوك، وەکو کامێرایەکی شاراوە خەزن دەکات، شێوازی هەڵسوکەوتی ئێوە، لە بارودۆخە سەختەکاندا، یەکێکە لە گرنگترین ئەو خاڵانەی، کە لە داهاتوودا، چارەنووسی منداڵ دەخاتە ژێر کاریگەرییەوەو لە بەرامبەر کێشەکاندا، خۆڕاگریی دەکات. لە ڕاستیدا، ئەو بە تۆمارکردنی دانە دانەی هەڵسوکەوتەکانی ئێوە، لە بارودۆخە جیاوازەکاندا، فێر دەبێت کە چۆن هەڵسوکەوت بکات. کەوابوو: بەباشی هەڵسوکەوت بکەنو مێردمنداڵەکانتان فێربکەن، کە لەگەڵ بچووکترین پێشهاتو ڕووداوێکدا، هەڵنەچن، ئەم ئەرکەی بە کردەوە فێری بکەن، کە هەڵسوکەوتی باش، کاریگەریی باشیشی دەبێتو یارمەتی دەدات، تا هەڵسوکەوتەکانی لەبارتر بکات. هەڵسوکەوتی ئەو، دیاریکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی ئەوە، لە ناو هاوڕێکانیداو لە ناو گەورەکانیشدا.

٥- زانیاریتان فراوان بکەن:- زانیاریتان لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵو مێردمنداڵەکانتاندا، فراوان بکەن. بە دڵنیاییەوە، ئێوە شتانێکتان لەبەردەستدایەو دەتوانن منداڵەکانتان پەروەردە بکەن، بەڵام بۆ پەروەردەی خوازراو، کەڵکوەرگرتن لەو کتێبانەی کە بنەماکانی هەڵسوکەوتی درووستو پەروەردەیی فێر دەکات، سوودمەندو بەرهەمدار دەبێت. ئەم کتێبانە بە کەڵك وەرگرتن لە زمانێکی سادەو نموونە نیشاندەرەکان، ڕێگاو شێوازی باشتربوونی هەڵسوکەوت فێر دەکەن.

٦- هاوڕێکانی مێردمنداڵەکەتان بناسن:- منداڵەکان بە هۆی ئەوەی کە لە دایکو باوکیانەوە فێردەبن، گرووپی هاوڕێیانیش، کاریگەرییان دەبێت لە سەریان، هاوڕێکان لە دووبارەکردنەوەی هەڵسوکەوتە باشو خراپەکاندا، کاریگەرییان دەبێت. کاتێك ئەوانەی کە لە دەوروبەری منداڵن، باشو بە ئەدەبن، بە تێپەڕبوونی کات، کاریگەری لە سەر منداڵ دەبێت، پێویستە دایکو باوك، دڵنیابن کە منداڵەکەیان، لەگەڵ کەسانی ڕێکوپێکو شیاودا بووە بە هاوڕێ. لەم نێوەندەدا، ئەم خاڵە فەرامۆش نەکەین، کە منداڵ کاتێك تێگەیشت، کە هەڵسوکەوتەکانی دایکو باوکو خێزانەکەی پابەندە، بە بنەما ڕەوشتییەکانەوە، هەوڵ دەدات وەکوو ئەوان، هەڵسوکەوت بکاتو هەڵسوکەوتە نەشیاوەکانی هاوتەمەنەکانی، کاریگەری لەسەر دانەنێن.

سەرچاوە - مجلەخانوادە/ ممتاز نیوز

و: هەورامان هانەدنی

# چۆن منداڵەکەت ئامادە دەکەیت بۆ چوونە قوتابخانە؟

گوڵان حەمەئەمین



کاتێـک منداڵ، دەگاتە ئاسـتی چوونـە قوتابخانـە، بێگومان خێـزانو دایکوباوک، بیـر لەوەدەکەنەوە، کە چـۆن منداڵەکەیان، بۆ باشـترین قوتابخانە بنێرن. هەندێجاریش دەبینین، منداڵەکان نایەنەوێـت، بچن بۆ قوتابخانە، یاخود دڵەڕاوکێیان تووش دەبێتو دەبێـت بە هۆی بێتاقەتییان. لێـرەدا چەند ڕێچارەیەك، دەخەینە بەردیدی ئێوەی ئازیز، تا بتوانن بەئاسانی منداڵەکانتان، بەچوونە قوتابخانە، دڵخۆش بکەن:-

١- منداڵەکـەت ببەو برۆ بۆ ئـەو قوتابخانەیەی بڕیارە لەوێ نـاوی تۆمار بکەیت، بەتەواوی شـوێنو جێگاکانی ئەو قوتابخانەی بیگەڕێنەو شـوێنەکانی پێ بناسـێنە، هەر لـە ژووری بەڕێوەبەرو مامۆسـتایانو هۆبەکانـی، بەتایبەت هۆبەی یەك، پاشـان باخچەو تەوالێتو کافتریا.

٢- هەموو ڕووداوەکان، کە لە ڕۆژەکانی سەرەتاوە ڕوودەدەن، بۆی شیبکەرەوە؛ بۆ نموونە: سەرەتا ڕیزدەبن، دواتر دەچنە ناو هۆبەی تایبەت، هەر مامۆستایەك وانەیەکی تایبەت دەڵێتەوە، مامۆستاکان، قوتابییەکانیان خۆشـدەوێت، پێویستە لە کاتی پشووەکاندا -ئەگەر ویسـتت- شت بکڕیت، یاخود تەوالێت بکەیت، ئەگەر ناچاربوویتو لە کاتی وانەدا پێویسـتت بوو، دەست بەرز بکەرەوەو بڵێ: مامۆستا یارمەتی هەیە، بچمە دەرەوە.

٣- جارجارە، چەند پرسـیارێکی ئاڕاسـتە بکە، بۆ نموونە: لە چی دەترسـیت، ڕووبدات؟ پاشـان لای ئاسـان بکەو تێی بگەیەنە؛ بەو شێوەیە نییە، ئەزموونە خۆشەکانی خۆت، یادەوەرییەکانتی بۆ بگێڕەوە، کە لە سـەرەتای چونـە قوتابخانەدا، ڕووی داوە، هەرگیز نەکەیت باسی لێدانو ئەزموونی ناخۆشی بۆ بکەیت.

٤- باسی وانەی وێنەو وەرزشو سروودی بۆ بکە، چونکە منداڵ وا دەزانێـت، قوتابخانە تەنها ئەرکو ماندووبوونەو یاریو خۆشـی تێـدا نییە، تا زیاتـر دڵی پێیخۆش بێت، هەروەها دڵخۆشـی بکە، بـە فێربوونو زانیارییەکان، بـۆ نموونە بڵێ فێردەبیتو دەتوانیت چیرۆك بخوێنیتەوە، ناوی شتەکان بە ئینگلیزی دەزانیت، دەتوانیت ناوی خۆت بنوسیت، ...هتد.

٥- بیبە بۆ بازاڕو پەڕاوگە، بۆ کڕینی جانتاو پێویسـتییەکانی قوتابخانە، ڕەچاوی ئەو ڕەنگو دیزاینانە بکە، کە حەزی پێیانە.

٦- شەوانە زووتر بیخەوێنە، پێش خەوتن بڵێ: کە بەیانی ڕۆژێکی زۆر خۆشە، بانگت دەکەم، تۆش خێرا هەڵدەستیت، چونکە مامۆستاکان ئەو قوتابیانەیان خۆشـدەوێت، کە باش خۆیان ئامادەکردووەو نانیان خـواردووە، هەوڵی لەگەڵ بدە، کە شـتێك میوە بێت، یاخود کوپێك شـیرو پارچەکێکێك بخوات، لە گۆڕینی پۆشاکەکانیدا، هاوکاریی بکە، ڕێنمایی بکە، چۆن جانتاو پۆشاکەکانی، لە پیسبوون بپارێزێت. هەوڵ بدە، زۆر سـۆزی نەجووڵێنیـت، وەك ئەوەی بە قوربانت بم، جا خۆ مـن بیـرت دەکەم، هەر دڵم لاتـە، بەڵکو ماچێکی بکـەو بەخێرایی بەڕێـی بکە، تا بیرنەکاتـەوە، لەوەی کە جێـت دەهێڵێت. بەهیوای سەرکەوتنی منداڵی هەموومان، لە تەواوی ژیاندا.



# یەکەمجار خۆت ببەخشە، پاشان دەستبەکار بە!

د. حوزەیفە عومەقی
و: ئەسکەندەر ڕەحیم

ژیان بەم شێوەیە.. پڕە لە هەڵەی بچووکو گەورە.. لە کەوتن‌و هەڵنووتان‌و ساتمەبردن. ئێمەش هەمیشە وەهاین، بە مەبەست بێت، یان بەبێ مەبەست، هەڵە دەکەین. ئەم هەڵەیە، ڕەنگە لەگەڵ دایکت، یان لەگەڵ باوکت، یان لەگەڵ ئەندامێکی خێزانەکەت، یان لەگەڵ هاوڕێیەکت، یا مامۆستایەکتدا بێت. گرنگ ئەوەیە، لە ئاکامدا دەردەکەوێت هەڵەیە.

**گرنگ نییە، قەبارەی هەڵەکە، چەندە؟**

**یان ئایا بە مەبەست ئەنجامم داوە، یان بەبێ مەبەست؟**

**گرنگ لەم کارەدا، ئەوەیە:-**

**سـەرەتا لە خۆت ببووریت‌و چاوپۆشی لێ بکەیت... پاشان دەستبەکار بیت.**

بەڵـێ.. گەر ئێمە، هێشـتا هەر دیلـی کەلەپچەکراوی ئەو هەڵانـە بین، کە لە ڕابوردوودا تێوەی گلاوین.. ئەوا بەیەکجاری‌و هەرگیـزاو هەرگیـز، ناتوانین لـەم ژیانەدا بـەردەوام بین‌و لە سەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی دیکە بچین. هەروەها گەر ئێمە، هێشتا شان بدەینە بەر تۆزوخۆڵی ئەو هەڵانەی لەسەر دڵ‌و دەروون‌و هزروهۆشمان نیشتووە، ئەوا لەگەڵ ڕێی بەرەو لوتکەدا، دەرنابەین‌و ناتوانین درێژەی پێ بدەین..

ناشکرێت تەنها هەنگاوێکیش چییە، بچینە پێش.. گەر هەر لە ڕابردوودا بژین!

**دەسا لەبەر خۆت!!**

پێش ئەوەی داوا لە خەڵکـی بکەیت، لێت ببورن.. لە خۆت ببورە.. ڕاستییەکیش هەیە، پێویسـتە بیزانیت.. ئەویش ئەوەیە: ئینسان لەبەرئەوە ناونراوە **ئینسان**، چونکە تووشی لەبیرچوونەوەو هەڵەکردن دەبێت؛ لەو کاتەشەوە کە دنیا دنیایەو تا ئەو ڕۆژەش دنیا دوایی دێت، سروشتی گشت مرۆڤێك، هەر وا دەبێت.

پەروەردگاری بەرزو بەشکۆمان، لەبەرئەوە ناوی خۆی ناوە بە **لێبوردەو بەخشـندەو لێخۆشبوو**، چونکە چاك دەزانێت ئەو مرۆڤەی بەدیهێناوە.. ئەو مرۆڤەی کە هەر خۆی زۆر زۆر شـارەزایە پێی.. نەك جارێـك، بەڵکو چەندان جـار، دەکەوێتە نـاو هەڵەوە.. جا لەبەرئـەوە، ناوی خۆی ناوە بە لێبوردەو بەخشـندە، تا لە مرۆڤ ببورێت‌و ببیەخشـێت.. هەر لەبەرئەوەشـە، تا ئەم کات‌و ساتە، کەسێکمان پێ شك نایەت، لە ژیانیدا، هیچ هەڵەیەکی نەکردبێت.

گەر کەسێکیشـت دۆزییەوە، لـە ژیانیدا هیچ هەڵەیەکی نەکرد بوو.. ئەوا باش بزانە ئەو کەسە بەدرێژایی ژیانی، هیچ کارێکی نەکردووە.

**هەردەم لەبیرت بێت!!:**

**هەتا تەمەنت بچێتە سەر.. هەڵە هەر دەکەیت!**

بەڵام ئەو تەنهـا جیاوازییەی هەیە، ئەوەیە: بەش بەحاڵی خۆت، زۆربەی ئەو هەڵانە، هەڵەی تازەن‌و لەڕێیانەوە پێ دەگەیت‌و گەشە دەکەیت. لێرەدا گرفت ئـەوە نییە، هەڵە نەکەیت.. بەڵام گرفتی ڕاستەقینە ئەوەیە: لەو هەڵانە، دەرس وەرنەگریت‌و فێرنەبیت.

ڕەنگە هێشـتا نەتزانی بێت، وشەی (**شـارەزا**)، کە هەمیشەو بەردەوام بەرگوێمان دەکەوێت، لەڕاسـتیدا خۆی «زاراوەیەکی سیاسییانەیەو بە باڵای هەڵەکانماندا دەبڕین».

سا لە ئێستە بەدواوە، گەرویستت لە ژیانتدا پێشـ بکەویت، ئەوا بـۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەر هەڵەیەکدا کـە لەژیانتدا، ئەنجامی دەدەیت، پەیڕەوی لەم ڕێوشـوێنەی خوارەوە بکەو ئەم ڕێوشوێنە بکـە بە پەیڕەوو پرۆگرامی ژیانی تایبەتی خۆت.. پاش ئەوەشـی خۆت لەسـەر خۆت تاقی دەکەیتەوە، ئەوسا هەر زوو لە مانای ئۆقرەیـی‌و سـەلامەتیی دڵ‌و دەروون تێدەگەیت.. ئەو ئۆقرەیی‌و سـەلامەتییە دەروونییەی هەر زوو هەسـتی پێ دەکەیت.. ئەو سـەلامەتییەی هەموو سـەرکەوتووەکانی ئەم جیهانە، بەباشی شارەزای هەن.

**گەر هەر هەڵەیەکت کرد، پەیڕەوی لەم خاڵانە بکە:-**

**١. لە هەر بارێکدا، بیچەو قەبارەی هەڵەکە، هەرچییەك بووە، خۆت ببەخشە.**

**٢. بەبـێ تەریقبوونەوە، یان دوودڵی، بە هەر کەسـێك، کە لە بەرامبەردا هەڵەت کردووە، بڵێ: «بمبوورە!!».**

**٣. بە گوێرەی توانا، دەستبەجێ هەڵەکەت ڕاست بکەرەوە.**

**٤. لـەم هەڵـەوە پەند وەربگرە.. هەرچیشـت بـۆ هاتە پێش، جارێکی دیکە دووبارەی مەکەرەوە.**

**٥. لەڕێی ئەم هەڵانەوە گەشە بکەو پێبگەو سوودیان لێوەربگرە.. پاشان دەست پێبکەرەوەو درێژە بە ڕەوت‌و ڕێگەی ژیانت بدە.**

# کۆتا وانه

و. له فارسییەوە
هەورامان محمد

بەیانیی ئەو ڕۆژە، کات زۆر درەنگ بوو، بۆ ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە، دەترسام بەڕێز "هامل" لەسەر درەنگکەوتنم، سەرزەنشتم بکات.

ئەو ڕۆژە، تاقیکردنەوەمان هەبوو.. منیش، هیچ شتێکم نەدەزانی، وا بە مێشکمدا هات، کە نەچم بۆ قوتابخانە.

ڕۆژێکی گەرم بوو، هێزە داگیرکەرەکان، لە کێلگەیەکی ئەو دەوروبەرەدا، سەرقاڵی مەشقو ڕاهێنان بوون، هەر چۆنێك بێت، بە خێرایی بەرەو قوتابخانە ڕامکرد. کاتێك گەیشتمە ناوەڕاستی شارۆچکەکە، چەند کەسێکم بینی، کە بەو نووسینانەی بە دەستیانەوە بوو، بەملاو بەولادا دەڕۆیشتن. هەر لێرەدا بوو، کە هەواڵەکانی جەنگیان ڕادەگەیاند. ئیدی بیرم کردەوە، کە دەبێت ئەمجارە، چی ڕوو بدات؟

بەهەناسەبڕکێ، گەیشتمە ناو قوتابخانە، هێشتا سەرەتای وانەکە بوو، وام بەبیردا هات، کە تا پۆلەکە بێدەنگ نەبووە، لەوانەیە بتوانم، بەبێ ئاگاداری مامۆستا، بچمە ناو پۆلەوە. بەڵام بەپێچەوانەی هەمیشەوە، پۆل زۆر بێدەنگ بوو. ناچار بووم، دەرگاکە بکەمەوەو بچمە پۆلەوە. بەڵام زۆر بە لامەوە سەیربوو، بەڕێز "هامل" بەبێئەوەی هیچ توڕەییەك، بە دەموچاوییەوە دیاربێت، بە نەرمییەکی زۆرەوە، گوتی: خێرا لەسەر جێگاکەت دابنیشە، هێندەی نەمابوو، بەبێ تۆ، وانەکە دەست پێ بکەین.

هەموو شتێك سەیربوو، بەڕێز "هامل" ئەو چاکەتە سەوزەی، کە ڕۆژانی تایبەت لەبەری دەکرد، ئەو ڕۆژە لەبەریدا بوو.

هاوپۆلەکانم خەمباربوون، زیاتر سەرم سوڕما، کاتێك کە چاوم بەو مێزانە کەوت، کە لە بەشی دواوەی پۆلەکەدابوون، پڕبوون لە خەڵکی غەمبارو خەفەتباری شارۆچکەکە.

بەڕێز "هامل"، بە میهرەبانییەوە گوتی: خۆشەویستەکانم، ئەمە کۆتا ڕۆژە، کە من بە زمانی دایك وانەتان پێ دەڵێمەوە، چونکە لە بەرلینەوە، بڕیار هاتووە، کە دەبێت قوتابخانەکان، لەمەودوا بە زمانی ئەڵمانی، وانەیان تێدا بگوترێتەوە.

ئەمڕۆ ئێوە، بۆ کۆتاجار بە زمانی دایکی خۆتان، واتە: زمانی فەڕەنسی، وانە دەخوێنن، واتە ئەمە کۆتا وانەی ئێمە بوو، بە زمانی دایكو من هێشتا نەمدەزانی، بەباشی بخوێنمو بنووسم. هەستم بەپەشیمانی دەکرد، کە بۆچی تا ئێستا، لە جیاتی فێربوونی زمان، هەر بە دوای گاڵتەو خۆشیو یاریکردنەوە بووم. ئەو پەرتووکانەی، کە پێشتر ڕقم لێیان بوو، لە لام خۆشەویست بوون.. چونکە بەڕێز هاملم نە دەبینییەوە، هەموو ئەو لێدانانەی، کە بە ڕاستە لێی دابووم، لەبیرم کرد.

کەواتە: لەبەر کۆتا وانەیە، کە ئەو جلە تایبەتەی لەبەر کردبوو، هاتنی خەڵکی شارۆچکەکەش، لەبەر پەشیمانبوونەوەیان بوو، لەوەی کە پێشتر هەوڵیان نەدابوو، بچنە قوتابخانەو لە پۆلەکاندا خوێندنو نووسینی زمانی دایکی خۆیان، فێرببن.

مامۆستا، داوای لێکردم کەوانەکە بخوێنمەوە، بەڵام من نەمدەزانی. بەڕێز هامل، گوتی: من سەرزەنشتی تۆ ناکەم، خۆت سزای ئەم تەمەڵیو سستییە دەبینیت، چ تەمبێکردنێکی گەورە دەبێت! ئێمە وا فێربووین، کە بە خۆمان بڵێین: بەیانی فێردەبین، ئێستا ئەنجامی چییە، ئێوە پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن، کە خەڵکی ئەم ئاوو خاکەن، بەڵام توانای نووسینو خوێندنی زمانی دایکی خۆتان نییە.

هەر گەلێك زمانی دایکی خۆی فەرامۆش بکات، وەك ئەو کەسە وایە، کە زیندان کرا بێتو کلیلی زیندانەکەی، ون بووبێت!

دواتر، دەستی کرد بە وانەگوتنەوەو بۆ یەکەمجار وانەکەم، بەباشی خوێندەوە، چونکە بەباشی لێی وردببوومەوە.

لە پڕ زەنگی کاتژمێرەکە، ١٢ جار لێی داو کاتی کۆتایی پۆلەکەی ڕاگەیاند. بەڕێز هامل، بە دەنگێکی خەمبارەوە، گوتی: خۆشەویستانی من.. بەڵام گریان قوڕگی گرتو نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات، دواتر بە تەباشیر لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسی:

بەرزو خۆڕاگر بێت نیشتمان..

بە جووڵەی دەستی پێی گوتین: دەتوانن بڕۆن.

نوسینی: ئالفۆنس دودە(نوسەری فەڕەنسی)// سایت کودکان کتابخانه نوجوان

# ناڵەی جودایی

لەو هەنگاوانە ستەمکارتر نەبوون، کە لە تۆیان دابڕیم، لەو هەنگاوانەش بەرزو پیرۆزتر نین، کە جارێکی دی، منیان بە دیداری تۆ شاد کرد!

لەگەڵ دەرکەوتنی نوری تۆدا، دڵی شەیدام، دەکەوێتە خورپە، ڕۆح وەك تەیری نێو قەفەس، دەکەوێتە سەما....

بەڵام خورپەی تەواوی دڵ، لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
کە سەرتاپا، لە ئاوازی بەهەشتی خواوە پەیدایە -هەردی-

ئەو هەنگاوانە لەگەڵ خۆیاندا ڕێگای پڕ درکوداڵی دووری دەپێچنەوەو لەدۆزەخی تەنیاییو زیندانی غوربەتو عەزابی بێتۆیی ڕزگارم دەکەن!

من بە بیستنی سڵاوێکی تۆ، شاگەشکە دەبم، چ جای جەنابتان بە لوتفو کەرەمی خۆتان، تەشریف بهێننە دیوانی غوڵامی خۆتان!!

قاصیدێ گەر بێ، لە تۆ بێنێ سەلامو بێتە لام
ژێری کەوشی ماچ دەکەم قوربان، بە تۆزو گەردەوە -صافی-

ئەی هاوار، منی غوڵام چۆن توانیم پشت لە تەختی شاهانەی تۆ بکەم ئەی شازادەکەم، لە کاتێکدا جگە لە من، کەس نەیتوانیوە ببێتە غوڵامی بەردەرگانەکەت...

گەر غوڵامیم پێ کەرەمکا، پادشاهیم کەی دەوێ
جێم لە بەردەرگا نەبێ، ڕوتبەو نیشانم بۆچییە -صافی-

تۆ سروەی ڕۆحو لەزەتی ژیانی، تۆ ئەو کەسەی کە لە نیگای تۆوە، دنیا دەبینم، تۆش هەر بەو شێوەیەی دەبینی، کە لە منەوە دیارە، چون تۆ بەگلێنەکانی من دەڕوانی!

ئازیزم، ئەو ڕۆژەی گەیشتمە زیارەتی باڵات، پێت گوتم: ئێرە چەند خۆشە!!

نازدارەکەم، ئەوە هەستی دڵەو زمانی ڕۆح! لەو شوێنە خۆشتر نییە، کە یاری خۆشەویستی لێیە، ئیدی ئەو شوێنە، هەر شوێنێك بێت!

بە گەیشتنی مەوکیبی شاهانەت، ئیدی شەماڵی عەنبەربۆی

توخوا خــــــــــۆت بیڵێ، نەونەمامی نۆ
مردن خۆشترە، یا دووری لە تۆ ؟؟ ((فۆلکلۆر))

هەناسەت ڕۆحم مەستەکا، سەفا دەبەخشێ بە ناخم!

کە دەگەمە حزوورت، لە قوتابخانەی ئەوینی تۆدا، چۆك دادەدەم، وانەی ئەوینی پاكو عیشقی حەقیقی دەخوێنم، لەوێدا لە جیهانە گەورەکەی خۆشەویستی پاكو ئەوینی بەرزو شکۆداردا لە زبڵوزاكو زەلکاوی دنیاویستی، پاك دەبمەوەو غەرقی دەریای نوردەبم! ڕۆمی دەڵێت: ئەوەی کراسێکی لە عیشقدا دڕاندبێ، ئەوا لە هەموو تەماعو خەوشێك پاك بووەتەوە!

لەوێدا لە دەرگای دڵەوە دەچمە نێو مەملەکەتی ئەوین!

لەو مەملەکەتەدا مرۆڤەکان تەنها وێڵی ڕۆحن نەك جەستە، چونکە هەموو دەزانن ئەوەی وێڵی جەستە بێت، هەرگیز لە ڕۆح تێناگات!

ئەوەی‌تەنهابەزمانی‌لاشەبدوێ‌،هەرگیزفێری‌زمانی‌ڕۆح‌نابێت!

لەوێدا بەندە  جگە لە تۆ شوغلی شاغیلی نییە!

هەمــوو عالــەم بە کەســبو کارێ مەشــغوڵن ئەمما بەندە
هەمیشە عاشقی ڕوتم ، شەهیدی چاوی شەهلاتم -ئەحمەد موختار-

ئەو ساتانەی کە وەکو پەروانە بە دەوری چرای ڕوخسارتا دەخولێمەوە، هەموو ئاواتم گەیشتنە بە ئامێزی گەرمت!

ئای لەو ساتانەی کە وەکو پەروانە، خۆت دەخزێنیتە ئامێزی گەرمی یارەوە!

ئای لە چێژو لەزەتی ڕۆح!

تــۆم لابــی، بــەهــاری دەگـــەڕێ پــایــزی عــومــرم
لاشــم نــەبی تــۆ، پــاییــزە عــومــرم لــە بــەهــارا -کــوردۆ-

ئازیزم گرنگ نییە لە کوێیت، گرنگ ئەوەیە لەژێر سێبەری کەپری خۆشەویستی یاردا، چرکەکانی ژیانت بگوزەرێ! چونکە تێپەڕبوونی چرکەکانی تەمەن، دوور لە هەڵمی هەناسەت مردنە، هەر ساتەو مردنێکی جیاواز، چونکە مردنی عاشقان، یەك جۆر نییە، ڕۆژی دەیان جار دەمرن، تا دەگەن بە زیندەگیی ڕۆح!

سەختترینو دژوارترین ساتەکانی ژیان، ئەو ساتەیە کە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەژی، کە کەس هێندەی ئەو خۆشی ناوێیو تۆش کەست هێندەی ئەو خۆشناوێ، وەلێ لەناکاو خۆت بە تەنیای تەنیا دەبینیتەوە!

من ئێستاش نازانم چۆن توانیم ماڵاواییت لێ بکەم، ئەو پەنجانە چۆن هەڵنەوەرین کە دوعاخوازییان لە تۆ کرد!

مافی خۆتە سزام بدەیت، نەدەبوا من هەرگیز جێت بێڵم..

لە بەینی ئێمە شەرت وابوو، جودایی یەك نەکەین هەرگیز
وەفای عەهدت نەبوو قوربان، بەجێتهێشتم بە تەنیایی -صافی-

بەڵام خودا دەیزانێ لەگەڵ ئاوابوونی خۆری ئەو ئێوارەیەدا، ئەو کاتەی بۆ دواجار ئاوڕم دایەوەو دوا سەرنجم لە سیمای نورینت دا، ئیدی چیم بەسەرهات!

چۆن گڕی جودایی وەك گڕەی چلەی هاوین چرۆی حەزو ئاواتو خۆزگەکانی یەك یەك هەڵدەپڕوکاندم!!

بۆ وادەزانی، جودایی هێندە ئاسانە؟

هیجرانو دووریی تۆ نەیهێشتم ئەزیزم، تاسەو چاوەڕوانی دیدار، سەبرو قەراری  بردم بەتاڵان!

عومــری مــن ســوتا، لەنێو کــورەی غەمی هیجــرو فیراق
کەیلــی مەیــلو دەردی تاســەو ئیشــتیاق -کەمەنـدی-

من بێ تۆ بەخودی خۆشم نابەڵەدم، بێ تۆ هەست دەکەم هۆیەك بۆ وجودی من نییە! ئیدی من کارێکم نامێنێ، وشەیەك نامێنێ بیدرکێنم، بێ تۆ، بۆ کێ بدوێم؟ چی بڵێمو باسی چی بکەم؟!

هــەتــا لــەو یــاری دەمـــســازە جــودا مــام
وەکــو نــەی بێ نــەوا، کــەوتــووەو بێدەنــگ -مــەحــوی-

بەڵام توخودا ئیدی بە دەردی جودایی سزام مەدە، تاڵاوی دووری مەکە بە گەرووما، چونکە هیچ شتێك هێندەی جودایی تاڵو دژوار نییە، هەرچی دەتەوێت بیکە، جگە لە هیجران، توخودا ئیدی کاری وا نەکەی!

تۆ بە لوتفی خۆت بمبەخشە، من چیم هەیە بیدەم لە کەفارەتی گوناهەکانمدا، جگە لە ڕۆحێك کە هەرگیز بۆ سەودای ڕیزوانی تۆ ناشێ!

منی گەدا، چیم هەیە بیبەخشم بە تۆ، سەرمایەی من تەنها ئەوینی تۆیە!

ئازیزم تۆ دەردو دەرمانی منی، عیللەتو شیفای منی، گەر نەیەی بۆلام، من لە چاوەڕوانیو تەنیاییدا دەمرم!

گوڵـەنـدام، ئـەی تـەنافی گـەردنـم، زوڵـفی پەرێشانت
عیلاجێ! چارەیێ، ڕوحمێ، ئەمان دەستم بە دامانت -وەفایی-

من بەرگەی هیجران ناگرم، سەحەر لەناڵەی جودابیم بێزاربوو، مانگە شەو بەزەیی بە گریانی مندا دێتەوە، گەر تۆ بەزەییت بە مندا نەیەتەوە، ئیدی خۆ من جگە لە تۆ کەسم نییە!

ڕێگەی چاوەڕوانی بەرنادەم، لە هاتنت نائومێد نابم، گەر لە سەرەمەرگیشا تەشریفت بگات، شادم بەوەی ڕۆحم بکەمە شاباشی هاتنت!

ڕەحمێ بکە ئازیزم بە دیدەی تەڕو جەرگی برژاوو ڕەنگی زەردو دڵی بریندارم، من نەخۆشو تۆش حەکیمی منی، دەرمانی دەردی من تەنها لای تۆیە، ئەی مەرهەمی زامو برینم.

دڵ نـەخۆشـی دەردی هـیـجرە، جانـی جـانـانـم وەرە
لـەت لـەتـە جــەرگو هــەنــاوم، مـاهـی تـابـانـم وەرە
عـیـللـەتی دەردو شـیـفـاکـەم وا بـە لـێوی شـەککـەرت
مایەی ژینو حەیاتم، دەردودەرمانم وەرە - تاهیر بەگی جاف-

دەستم بەدامێنت، تەنها بۆ هەواڵپرسینی نەخۆشەکەی خۆت، سەرێ لە کوڵبەی ئەحزانی ئەم غوڵامەی خۆت بدە، تەنها نیگایەك بە تیلەی چاوەکانت، بە گەنجی قارونو سیحری هاروتو ماروت نادەم.

شەکوای دڵو ئەرزوحاڵی  ڕۆحە، شازادەکەم..............،
چی دەبێ جارێ داوام قبوڵ بفەرمووی..

بۆ هەواڵپرســی، نەخۆشــی خۆت، چییە گــەر یەك دەمێ
یــا لەبەر خوا، یــا لەبەر ڕەغمــی ڕەقیبانــت وەرە -صافی-

گەرمیانی

# نامە نوریەکان

## نامەی سی و دوو

ئازیزم: وتەیەکی عەبدوڵڵای کوری عەون زۆر سەرنجی ڕاکێشام کە دەڵێت: ئەگەر کەسێك هەموو کارەکانی بە یەکێك لە پاشاکانی دونیا بسپێریو خۆی تەسلیمی بکات سودمەند دەبێت، ئەی ئەگەر کەسێك خۆی تەسلیمی خودایەك بکات کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو پەروەردگاری هەموو بونەوەرەو ئەوەی لەژێر گڵێشدایە موڵکی ئەوە!!

لەم زەمەنی ئاشوبو نارەحەتیو گرفتارییەدا، بەندایەتی بۆ پەروەردگارو پتەوکردنی پەیوەندی، تاکە هۆکاری دڵنیاییو ئارامیو سەعادەتە!

﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الأنعام: ١٦٤

نا، هەرگیز ئێمەی بەندە، دوای خوداوەندی خۆمان بۆ پەروەردگارێکی دی ناگەڕێین، دوای ئەو خودایەی کە پەروەردگاری هەموو بونەوەرێکە! ئیدی ئێمە ئاتاجمان بە کەس نییە جگە لە ئەو!

(تەوحیدی ربوبیەت) واتە:- یەکتاپەرستی پەروەردگار، فێرمان دەکات کە خودایەکی گەورە، پەروەردگارێتی لە هەموو جیهان دەکات، بە تەواوی هەموو مەخلوقاتو هەموو بوونەوەرەکانییەوەو جڵەوی هەموو کارەکان، تەواوی ڕووداوەکان، تەنها بەدەستی ئەوەو

بەس!

لەو ڕۆژەوە دڵۆپەیەك ئاوین، خوداوەند بە لوتفی خۆی چاودێریمان دەکاتو پەروەردەمان دەکات، هەموو بەدیهێنراوەکان، لە پەروەردگاری خوداوەند هیدایەت وەردەگرن، بۆ زیندەگی‌و ژیان.

پێش ئەوەی بێینە سەر زەوی، گوێ‌و چاوو دڵو هەستی پێ بەخشیوین، کە ئەو کات ئێمە نە پێی دەبیستین‌و نەپێی دەبینین‌و نە هەستی پێ دەکەین!

وەلی لەگەڵ هاتنمان بۆ سەرزەوی هێدی هێدی ئەو وەسایلانە دەکەونەکار! هەر دوو سێ ڕۆژەو ئیدی چاو بە نێو ماڵدا دەگێڕین، لە بچوکترین دەنگ وەئاگادێین‌و لە خەو وەخەبەردێین!

چەند حەوتەیەکەو ئیدی دایەو بابە دەناسین‌و هۆگریان دەبین!

پاکی‌و بێگەردی بۆ خوداوەند..

﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل: ٧٨

پەروەردگارێتی خوداوەند، واتە خالیق‌و مالیك‌و مودەببیرە!

خالیق‌و بەدیهێنەرو بنیاتنەرو دروستکەری هەموو بەدیهێنراوەکانە.

هەر ئەویش خاوەنداری لە هەموو موڵکو سەروەتو سامانی ئاسمانو زەوی‌و ئەوەی کە تیایاندایە دەکات، رزقو ڕۆزی، ژیانو مردن، دەردو شیفا، ماڵو سەروەت، بەرزی‌و نزمی، بوونو نەبوون، دارایی‌و نەداری، تەنها ئەو خاوەنێتی.

هاوکات بەڕێوەبەری کاروباری کەونو کائینات، ڕێکخەری سیستەمی گەردون، تەنها بەدەستی ئەوەو جڵەوگیری هەموو کاروبارەکان تەنها بۆ ئەوە.

لە هەموو ئەم کارانەدا خوداوەند هاوڕێ‌و هاودەمو شەریکێکی نین.

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الأعراف: ٥٤ هەربۆیە هەندێك لە زانایان لە پێناسەی تەوحیدی ربوبیەت دا دەڵێن: (هو توحیدالله فی أفعاله) واتە: بە یەکتادانانی خودایە لە کردارەکانیدا! بەو مانایەی خودا هەرکارێك کە دەیکات بە تەنیا ئەنجامی دەداو کەس هاوفەرمانی ئەو نییە!

خەلق‌و ئەمرو موڵکو تەدبیرو فەرمانو هێزو دەسەڵات تەنها هی ئەون! خودای گەورەش بۆ ئەوەی بەندەکانی باوەڕ بەمە بکەن، هەزاران هەزار بەڵگەی بەرچاوی خستۆتە بەردەستی بەندەکان، بە شێوەیەك کە لە ژمارە نایەن، چونکە بە هێندەی ژمارەی مەخلوقاتی خودا کە هەر خۆی ژمارەیان دەزانێ، بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتی خوداوەند هەیە!

﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَـٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ، وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ الذاریات: ٢٠ ــ ٢١

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

جارێکیان پرسیاریان لە ئیمامی شافیعی کرد سەبارەت بە وجودی خوداو گەورەیی‌و دەسەڵاتی پەروەردگار، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: گەڵای توو!

ئامادەبووان وەڵامەکەیان پێ سەیر بوو، یانی چی گەڵای توو؟!

پێشەوا شافیعی فەرمووی: تەماشاکەن هەمان گەڵای توو کرمی ئاوریشم کە پێی دەگوترێت (قەز)و دەیخواتو دەیکات بە ئاوریشم!

هەنگ دەیخواتو دەیکاتە هەنگوین!

مامزیش دەیخواتو دەیکاتە میسکی بۆنخۆش!

کێ سەرچاوەکەی یەکخستو بەرهەمەکانی جیاوازکرد؟ جگە لە پەروەردگار.

ئەمە تەنها بەڵگەیەکی بچووك لە گەڵای دار توویەك!

ئەی ئەگەر باس لە ئەرکانی ربوبیەت بکەین کە بریتین لە (خەلق‌و موڵکو تەدبیر)، بیر لەوە بکەینەوە کە ئەو هەموو ژمارە بێ هەژمارەی بونەوەر لە مرۆڤو ئاژەڵو باڵندەو ماسی‌و نەهەنگو زیندەوەرانی دەریاو بیابانو ژێرخاکو سەرخاکو زیندەوەرگەلێك کە بەچاو نابینرێن، هەموویان رزقو ڕۆزیان لەسەر پەروەردگارە! پەروەردگارێکی بەتوانا

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ الذاریات: ٥٨

ڕۆزیدەرێك کە بێ سنوور دەبەخشێ، کەس ناتوانێ، ڕێگری لە رزقی ئەو بکات ..

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ آل عمران: ٣٧

موڵکداری هەموو موڵکو سامانێك هەر بۆ ئەوەو هەموو پاشاو موڵکدارو دەوڵەمەندەکان ڕۆژێك دادێ، موڵکو سەروەتی خۆیان جێدێڵن، کە خوداوەند پێی بەخشیون!

ئەوە لاوازی مرۆڤەکانە کە چاویان لە دەستی مرۆڤێکی لاوازی وەکو خۆیانە، تا خەڵاتیان بکات، یان نزاو تکاو پاڕانەوە بۆ شیفاو لابردنی دەردو بەڵا لە دارو بەردی بێ گیان دەکەن، گەنجینەکانی ئاسمانو زەوی تەنها هی خودان!

﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴾

المنافقون: ٧

ساڵەهای ساڵە بەڕێوەبردنی گەردونێك بە مانگو خۆرو هەسارەو ئاسمانێك کە ملیۆنەها ئەستێرەی کردۆتە ملوانکەی سنگو گەردنی، جگە لە تەدبیری ئیلاهی کێ هەیە دەستی لەو بەڕێوەبردنەدا هەبێت؟!

﴿ فَسُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ یس: ٨٣

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ یونس: ٣١

پیرەمێردی شاعیریش دەڵێت:

خوایە ئەوانەی کە بێ باوەڕن    هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەرن
ئەگینا سەیری باخێکی گوڵ کەن    تەماشایەکی بە ئەقڵو دڵ کەن
ئەو ڕەنگە جوانەی پەڕەی هەرجایی    بە زەرەبینی تیشکی بینایی
لێی وردبینەوە کە ئەو صەنعەتە    کێ دەڵێ زادەی، خووی تەبیعەتە؟

ع. ش. شێرکۆ

# لەگەڵ صافی هیرانی شاعیردا



گوڵنار روخست رەشکی بە گوڵزاری ئیرەمدا
دوو طاقی برۆت طەعنی لە میحرابی حەرەمدا
ڕوح مەستە لە راحی تۆ، لە نێو عالەمی ئەرواح
باطین لە (بلی) دایەو ظاهیر لە (نعم)دا
هەستاوی کە هەستاوە قیامەت بە قیامەت
رۆییوی کە رۆییوە دەمم، لەو دەمو دەمدا
دڵ وا لەبەر ئازاری وەکوو نەقطەی زارت
گاهێ لەوجوودا هەیە، گاهێ لە عەدەمدا
بۆچی نەگری دڵ لەسەر ئەم شێوە پەشێوە
وا حەبسە لە نێو چینی، چەمی پەرچەمی چەمدا
گەر بێتو بەسەرخۆشی بپرسی لە نەخۆشیم
(حق القدم)ـە روح لە قەدەمگاهی قیدەمدا
(صافی) لەبەر ئەم خەیاڵە، خاڵی لە خەیاڵە
یاکێمی بە زۆردایە، وە یا زۆری بە کەمدا

شاعیر ناوی موستەفای کوڕی عەبوڵڵای سانی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ سولەیمانی هیرانییە، ساڵی (١٨٧٣) لە هیران لەدایکبووەو ساڵی (١٩٤٢) هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

صافی- غەزەلخوانێکی بەتواناو شاعیرێکی بەهرەمەندەو خاوەنی دیوانی شیعرەو چەندین قەصیدەی ناسکو شیرینی هەنو بە چوار زمانی کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکی، شیعری نووسیوە.

شیفتەیی نووری جەماڵم ماهی تابانم وەرە
ئارەزووی شەهدی ویصاڵم جانی جانانم وەرە
ڕۆژی عیدە چاوەڕێم بێی بەقوربانم بکەی
کوشتنیشت ڕەحمەتە، سەد جار بە قوربانم وەرە
بێ دەوای وەصلەکەت دەردم عیلاجی ناکرێ
دەردی بێدەرمان هەتا کەی؟ دەردو دەرمانم وەرە
-صافی- تا ڕۆژی قیامەت هەر دەناڵێنێو دەڵێ
تا نەفەس ماوە لە قەلبم یاری پەنهانم وەرە

------------------------------------------

عاریضی یارم گرۆی حوسنی لە گوڵشەن بردەوە
بۆیە گوڵ، خاری غەمی سەرتابەپا دەرکردووە
گریەو زاریم لەگەڵ بولبول قیاسی ناکرێ
چونکە تا مردن، دەناڵم من بە ئێشو دەردەوە

------------------------------------------

من کە وا مەحرومی یارم زیندەگانم بۆچییە
وا بە دەردی وی گرفتارم ژیانم بۆچییە
نیعمەتی دونیا بەمایە کەی حیسابە بۆ دڵم
بێ مەتاعی چاوەکەی سوودو زیانم بۆچییە
نامەوێ باغی وەنەوشەو سونبولو ڕەیحانو وەرد
غونچەی لێوی نەبێ ڕوحی ڕەوانم بۆچییە؟